# بۆ خوا

## پاشان

# بۆ مێژوو


نووسەر

موسى الموسوي

وەرگێڕ

کەسیار عبدالله

## لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی سارا

**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب: بۆخوا پاشان بۆ مێژوو
نووسینی: **سەید حەسەن موسەوی**
**وەرگێڕانی : کەسیار عەبدوڵڵا**
نۆبەتی چاپ: چاپی سێیەم ۲۰۱۰
چاپ: چاپخانەی چوارچرا
تیراژ: ۱۰۰۰دانە
ژمارەی سپاردنی (۲۱۱۸) ساڵی ۲۰۰۸

# بسم الله الرحمن الرحیم

سوپاس وستایش بۆخوای جیهانیان ، درودوسەلام لەسەر پێغەمبەری نازدار وئەمین ولەسەرکەس وکارەباش وپاکەکانی وشوێن کەوتوانیان بەچاکە تارۆژی دوایی.

پاش ئەمە:

موسڵمان چاك دەزانێ کە ئەم ژیانی دونیایە بە مەرگ کۆتایی دێت، پاشان چارەنوسی دیاری دەکرێت:جایا بۆ بەهەشت،یا بۆ دۆزەخ،گومان لەودا نیە کە مرۆڤی موسڵمان سورە لەسەر ئەوەی یەکێك بێ لەوانەی دەچن بەرە و بەهەشت،هەر بۆیە پێویستە کاربکات بۆ بەدەست خستنی ڕەزامەندی پەروەردگاری ولەهەمو ئەو شتانە خۆی بە دوربگرێ کەمرۆڤ دەخەنە بەر رق وتوڕەیی خوا،پاشان سزای بە ئێشی،هەر بۆ یە دەبینین کەموسڵمان دەبێ سوربێت لەسەر گوێڕایەڵی پەروەردگاری وهەمو ئەو ڕێگایانە بگرێ کە لەخوای نزیك دەکەنەوە،ئەم کارە ڕەوشتی کەسە سادە وڕەشەخەڵکەکەیە لە نێوموسڵمانان دا کەدەبێ وابێ،دەی دەبێ ئەوانەی کەجیاوازن چۆن بن؟

وەك زانراوە ژیان تولەڕێی زۆر و هەڵفریوانی جیاجیای تێدایە،کەسی ژیر ئەوەیە ئەو ڕێگەیە بگرێ کە دەیگەیەنێ بە بەهەشت گەرچی ئەو ڕێگەیەش گران بێ،وە دەبێ واز لەو ڕێگەیە بهێنێ کەدەیبات بەرەو دۆزەخ،گەرچی ساناوئاسانیش بێت.

ئەمە گێڕانەوەیەکە بە جۆرێك داڕێژراوە کە بەزمانم وتومە،وبە پەنجەکانم نوسیومە، مەبەستیشم تەنها ڕەزای خوایەو سودی برایانە تا ئەودەمەی خۆم زیندوم؛ پێش ئەوەی بخرێمە نێو دوتوێی کفنەکەمەوە.

من لەشاری (کەربەلا) لەدایك بوم،لەژێرچاودێری دایك وباوكێكی دینداردا و لە ژینگەیەكی (شیعی)دا گەشەم كردووە. لە قوتابخانە دینیەكاندا وانەم خوێندووە تابومە گەنجێكی پێگەیشتو، دواتر باوكم ناردمیە (كۆڕی زانستی نەجەفی)كە بە دایكی هەموكۆڕەزانستیەكان دادەنرێت لەجیهاندا(مەبەست لەلای شیعەكان خوێندن لەكۆڕەزانستیەكان لەشاری نەجەف)،تا لە زانستی كەڵە زاناكانی وبەناوبانگەكانی ئەوسەردەمە زانست وەرگرم،نمونەی ئەوانەش وەك:سەماحەتی پیشەوا سەید(محمد آل الحسين كاشف الغطاء).

لە قوتابخانە زانستیە بەرزەكەی (نەجەف) دەستمان كرد بە خوێندن هیواوئاواتم ئەوەبو كە ڕۆژێك بێت منیش ببم بەیەكێك لەسەرچاوە دینیەكان كە بتوانم جێی خۆم بكەمەوەو ڕێ خۆش بكەم بۆ سەرۆكایەتی (حەوزە)، تا خزمەتی دین ونەتەوەكەم بكەم وموسڵمانان هەڵنێم هیوام ئەوە بو كە نەتەوەی ئیسلام ببینم كەببنە یەك نەتەوە و گەل ویەك پێشەوا پێشەوایەتیان بكات لەهەمان كاتیشدا وام دەبینی كەولاتانی بێباوەڕ ورد و خاش دەبیّ و لەبەردەم ئەم نەتەوەی ئیسلامەدا بەرزیی یەكەی دەڕوخیّ،وەچەندین ئاواتی تروەك هەر گەنجێكی موسڵمانی بەغیرەت كەهەبیومنیش دەم خواست وهەم بون،وەدەم پرسی:چی وای لێكردوین كە ئاوەهابمان گەیەنێتە ئەم حاڵە شپرزەییە لە دواكەوتن ولێك ترازان وناكۆكیە؟ وە پرسیارم لەزۆرشت دەكرد كە بە دڵمدا دەهات،وەك ئەوەی بەدڵی هەر گەنجێكی موسڵماندا دەهات،بەڵام هیچ وەلامم بۆئەم پرسیارانە دەست نەدەكەوت.تاخوای گەورەكار ئاسانی بۆكردم كەپەیوەندی بەخوێندن وبە دواگەڕانی زانستدا بكەم،لەماوەی ئەوسالانەی خوێندنم داچەندەها دەق دەهاتنەپێش چاوم ورایان دەگرتم،وچەندین بابەت كە بیریان خەریك دەكردم،وەچەندین ڕوداوكەسەرسامیان دەكردم،بەلام هەموجاریَ

خۆم تاوانبار دەکرد کە من خراپ لێیان دەگەم وکەمی تێگەیشتنی خۆمە،هەوڵم داجارێکیان پرسیارێك لەیەکێك لەمامۆستاکانی حەوزە بکەم ، بەڵام ئەو زۆر زیرەك بو،چونکە زانی چۆن چارەسەری ئەم پرسیارە لەمن دابکات،هەر لە سەرەتاوە ویستی پرسیارەکەم لەباریەریێ،بە چەند وشەیەکی زۆرسادەپێ ی وتم:تۆلەحەوزەچی دەخوێنی؟وتم:بێگومان بۆچونەکانی ئال وبەیت.

پێی وتم:ئایاگومانت لەبۆچونەکانیان هەیە؟زۆربەتوندی وەڵامم دایەوە:پەنا بەخوا.

وتی:دەی کەوایە ئەم وەسوەسانە لە دڵتدا دورخەرەوە،چونکە تۆ لەشوێن کەوتوانی ئال وبەیتی(سەلامیان لەسەر)ئال وبەیتیش لەمحمد(صلی الله علیە و سلم)ەوە زانستیان وەردەگرن،محمدیش لەخواوە.

کەمێك بێدەنگ بوم و دواتر نەفسم ئاسودە بو،پاشان پێم وت:بارك اللەفیك، ڕزگارت کردم لەم وەسوەسانە،پاشان گەڕامەوە بۆخوێندنەکەم،بەڵام ئەم پرسیارانەجارێکی ترگەڕانەوە مێشکم؛چەندە لەخوێندندا بچومایەتە پێش پرسیارەکانیش زۆردەبون وبابەت وڕەخنەکان پتر.گرنگ بەسەرکەوتوی خوێندنم کۆتایی پێهێناومۆڵەتی زانستیم وەرگرت لەوەرگرتنی پلەی (ئیجتهاد) لەسەر دەستی یەکێك لە هەرە زاناکانی سەردەمی خۆی کەسەماحەتی سەید (محمد حسین آل کاشف الغطاء) سەرۆکی حەوزە، ئیتر لێرەوە زۆر بە هەندەوە بیرم لەم بابەتە کردەوە،ئێمە بۆچونی ئال بەیت دەخوێنین،بەڵام لەوەی کە دەیخوێنین چەندین تانەوتەشەر لە ئال وبەیت دەخوێنین، ئێمە بۆیە کاروباری شەریعەت دەخوێنین تاپەرستشی خوای پێ ئەنجام بدەین،بەڵام چەندین دەق هەن کە بە ڕاشکاوی بێباوەڕییە بەخوای گەورە.

ئەی خوایەگیان ئێمەچی دەخوێنین؟ئایابەڕاستی دەگونجێ ئەمە بۆچونی ئال وبەیت بێ؟
ئەمە بەجارێ کەسایەتی مرۆڤ هەڵدەتەکێنێ،چۆن دەکرێ مرۆڤ خواپەرستێ و لەهەمان کات دا بێباوەڕبێ پێی؟چۆن شوێن پێغەمبەروکارەکانی دەکەوێ ولە هەمان کات دا تانەشی لێبدا؟چۆن دەکرێ کەسێ شوێن ئالوبەیت بکەوێ و بۆچونەکانیان بخوێنێ،لەهەمان کاتداجوێن وقسەیان پێ بڵێ؟
پەروەردگارە سۆزومیهرتم پێ ببەخشە،گەر تۆڕەحمم پێ نەکەی من لە گومڕایان دەبم، بە ڵکولەخەسارەوەمەندان دەبم ، دەگەڕامەوەو لە خۆم دەپرسی: دەبێ هەڵوێستی ئەو بەڕێزو پێشەوایانەوهەمو ئەوانەی پێشوتریش کە ڕۆیشتون،لەو کەڵە زانایانە،دەبێ هەڵوێستیان لەم بارەوە چی بێ ،ئایا مەگەر ئەو شتانەی من دەیبینم ئەوان نەیان بینیوە؟ ئایا وەك من خوێندومە،ئەوانیش نەیان خوێندووە؟
بەڵێ، بەڵکو زۆرێك لەو کتێبانە دانراوی خودی خۆیان بووە و،هەر بە پێنوسی خۆشیان ئەو شتانە نوسراوەتەوە ، بە ڕاستی ئائەمە دڵمی دەهەژاندو برینداری دەکردو،ئازار وخەمی بۆ زیاد دەکرد،پێویستم بەکەسێك بوکە ئەم دەردانەی لاباس بکەم وئەم ناڕەحەتیانەی خۆمی لابدرکێنم ،بۆیە دواجار بیرێکی چاك بە مێشکمدا هات،ئەویش ئەوەبو کە سەرلەنوێ خوێندنەوەیەکی گشتی وسەرتاسەری بۆ بابەتە زانستیەکەی خۆم بکەم،هاتم هەرچی ئەو سەرچاوانەی کەوتە بەردەستم خوێندمنەوە، لە وانەی کەجێی باوەڕن ، لەوانەشی کە وانین، نەك هەر ئەوەندە،بەڵکو هەر کتێبێکم بکەوتایەتە بەردەست،لە چەندین برگەو دەقی ئەوکتێبانەدا شتی وەهایان تێدابوکە ناچاردەبوم هەڵوێستەیان لە بەرامبەردا بکەم ودواتر هەستم دەکرد کە دەبێ قسەیان لەسەر بکەم هاتم لەو

هەمو ئەو دەقانە ژمارەیەکی زۆرکەمم لێیان هێنا تا ئەوەی لەدڵمدایە لەسەریان بنوسم،پاش ئەوەی کە لەخوێندنەوەی سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان لێبومەوە، بینیم کۆمەڵێکی زۆرلەپەڕە لە لام کەڵەکە بو،منیش ئەمانەم هەموی لەلای خۆم پاراست بەئومێدی ئەوەی خوارۆژێك بهێنێ ئەوەی کەبڕیاری داوەڕوبدات.

پەیوەندیم لەگەڵ هەموو مەرجەعەدینیەکان وزاناومامۆستاکان وئەو بەڕێزانەش کە بەخزمەتیان گەیشتبوم بەچاکی هێشتمەوە، وە تێکەڵاویان دەبوم،بەئومێدی ئەوەی بگەمە ئەنجامێکی وا کە ئەگەر رۆژێك لەرۆژان بڕیارێکی قورسم دابارمەتی دەرم بێت،لەسەر زۆرشت هەڵوێستەم کردوتێڕامام،تاگەیشتمەئەوباوەڕەی کەبڕیارە قورسەکە بدەم،بەڵام بەدوای فرسەتێکی گونجاودا دەگەڕام، بۆیەبیرم لەهاوڕێی خۆم زانای بەڕێز(سەید موسى الموسوی) کردەوە،بینیم ئەوبۆم نمونەیەکی چاك وجوانەتاچاوی لێبکەم،کاتێ کەئەویش وەختی خۆی هەمونەولادانانەی کە(شیعە)بەسەریدا هاتبو،ناڕەزایی دەربڕی ،بە ئاشکرا هەموی ڕەتکردەوە،وە هەمو ئەو هەوڵە چاکانەی کەدای بۆڕاستکردنەوەی ئەوپرۆگرامە،پاشان کتێبی برای بەڕێزم (احمدکاتب) دەرچو بە ناوی(پێشکەوتنی بیری شیعە)"تطورالفکرالشیعی" ،پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبەش ،هەستم کرد کە ئیترنۆرەی منیش هاتووە، کە قسەی ڕاست بڵێم، وە بەرچاوڕۆشنی بدەمە ئەو هاوڕێیانەی ترم کە هەڵخەڵەتاون،چونکە بە ڕاستی ئێمەوەك زانایان لە دواڕۆژدا بەرپرسیارین،بۆیە پێویستە ڕاستی وبەرچاو ڕۆشنیان بدەینێ گەرچی تاڵ وناڕەحەتیش بێ.لەوانەیە شێوەی دەرەنجامە زانستیەکانی من جیاوازتر بێت، لە شێوەی بەڕێزان (موسەوی واحمدکاتب)ئەمەش بەهۆی ئەوهۆکارانەی کە هەریەك لە ئێمە لە ئەنجامی ئەوخوێندنەوەی کەپێی هەستاوە پێی گەیشتووە.

لەوانەیە ئەو دوبەڕێزە بارەکەیان تەواو لەباری من جیاوازتر بوبێ،چونکە هەریەکەیان،ولاتی عێراقیان جێهێشتووەو،لەیەکێ لەولاتەکانی رۆژئاوا نیشتەجێن،وە کارەکە لەوێوە دەستی پێکردووە. بەلام من تائێستاش لەعێراقدام وبەتایبەتیش لەشاری (نەجەف)و ئەو توانایانەی وان لەبەردەستی مندا ناگەنە ئەو توانایانەی لەبەردەستی ئەو بەڕێزانەدا بووە،چونکە من لە پاش بیرکردنەوەیەکی دوورودرێژ لە نێوان ڕۆیشتن ومانەوەم،بڕیاری مانەوەو کارکردنم دا لەعێراقدا،وەمن زۆر دلنیام کەلێرە زۆرلەوبەڕێزانە هەن کە هەست بە سەرزەنشتی ویژدانیان دەکەن،کاتێ کە لەوشتانەی دەیبینن خۆیان بێدەنگ کردووە وزازی بون پێی،وە ئەو هەمو سەرچاوە گەورانەشیان وا لەبەردەستدا،من داوا لەخوا دەکەم کەئەم کتێبەی من ببێتەمایەی بەئاگاهێنانەوەیان و وازهێنان لەرێگەی پوچ،گرتنەبەری رێگەی راست.لەپاش ئەم نوسراوە ئیتر بەراستی ئەو بەڕێزانە بەلگەیان لەسەرکراوەو هیچ بەهانەیەکیان نیە.

لێرە هەندێ لەو بەڕێزانەی کەپەیوەندیم لەگەلیاندا هەیە،سوپاس بۆخوابەدەم داواکەمەوە هاتون،ئەوانیش گەیشتون وئاگاداربون بەوراستیانەی من ئاگاداربوم وپێی گەیشتوم،ئەوانیش ئێستابانگەشەی کەسانی تردەکەن،داواکارم لەخوامنیش وئەوانیش سەرکەوتو بکات بۆبەرچاوڕۆشن کردنەوەی خەلکی لە راستی، و ئاگادارکردنەوەیان تا نەکەونە نێوگێژاوی لادان بەرەو نارەوایی، وە تەنهاهەرخوای گەورەش خاوەنی ڕێزی تەواو لێپرسینەوەیە.

من زۆردلنیام کەئەم کتێبەم ڕوبەڕوی زۆرێك لەتۆمەت خستنەپال و بەدرۆ خستنەوەو رەخنە دەبێتەوە،ئەمە هیچ زیانم لێنادات،چونکەمن بیرم لەمانە هەموی کردۆتەوە،وە دەشزانم تۆمەت بارم دەکەن بەوەی کەمن بە کرێگیراوی

ئیسرائیلم ، یا ئەمەریکا،یاتۆمەتبارم دەکەن بەوەی کەمن دینی خۆمم فرۆشتووە بە کەمێك شتی دونیایی، ئەمەنەجێی سەرسامییەو نە شتێکی نامۆشە،چونکە لەوەوپێش بەرێز(موسی الموسوی) یشیان بەم شتانە تۆمەتباردەکرد،هەتا بەرێز(علی الغروی) دەیوت: پاشای سعودیە (فهدبن عبدالعزیز) دکتۆرموسەوی بەئافرەتێکی جوانی بنەماڵەکەیان فریوداوەو ،پەیمانی پێ داوە گوزەرانی بۆباش بکاو بڕێکی باشی پارەی لە بانقەکانی ئەمەریکا بۆ داناوە ،تا بچێتە نێومەزهەبی وەهابیەکان.

دەی گەرئەمە چارەنوسی دکتۆر موسەوی بێت لەدرۆوبوختان دروست کردن بۆی و دەنگۆی بێ بایەخ،دەی دەبێ بەش وچارەنوسی من چی بێ وچیم لەبارەوە بلاَوکەنەوە؟ لەوانەیە بگەڕێن بم کوژن،وەك چۆن ئەوانەی پێش منیان کوشت کاتێ کە لەگەڵ ڕاستیدا ڕاوەستان،وەك کوشتنی کوڕی (اية الله العظمی پێشەوا سەیدحەسەنی ئەصفەهانی) گەورەترین پێشەوای شیعەبووە تائەمڕۆش لەدوا سەردەمی دیارنەمانی گەورەوە، بەبێ ڕاجیایی باوکی گەورەی زانایانی شیعە بووە،ئەوەبو کاتێ کوڕەکەی ویستی بەرنامەو پرۆگرامی شیعە ڕاست بکاتەوە و ئەو لادانانەی تێیدایە لایانبات،کوشتیان وتۆزقاڵێك نەرمیان نەنواند لەبەرامبەریداو ، هەروەك چۆن مەڕسەردەبڕدرێ ئاواسەریان بڕی تا بتوانن بەربەو پێشەوایە بگرن لەڕاست کردنەوەی لادانەکانی شیعەدا وەك چۆن پێش ئەویش (ئەحمەد کەسرەوی)یان کوشت،کاتێ کە بێبەری بونی خۆی لەولادانانە ئاشکراکرد،ویستی شیعە ڕاست بکاتەوە،بەلاَم ئەوان لاشەیان پارچەپارچە کرد. زۆرێك هەن کاتێ کە ویستویانە ئەم بیرە پوچ وناڕەوایانەی.

کە هاتۆتە نێوشیعەگەرێتیەوە ڕەت بکەنەوە ، بەم دەردەچون،بۆیە هیچ نامۆیی نیە گەر هەمان شتیش لە بەرامبەر مندا بکەن.

ئەمانـە هـیچ بـەلای منـەوە گـرنگ نیـە بەسـە بـۆمن کـە بـوانم ڕاسـتی بڵێم،هاوڕێیـان و برایـانم ئامۆژگـاری بکـەم وئاگـادار بکـەم، وسـەرنجیان بـۆلای ڕاستی ڕابکێشم،خۆ ئەگەر مـن ئـارەزوی شـتی دونیـایم هەبوایـە (موتعـە)کـردن وپێنج یەك بۆمن بەس بـوو،دەمتـوانی بـەم دوکـارە ژیـانی دونیـا بۆخـۆم دابـین بکەم، وەك کەسانی ترکە پێی دەوڵەمەند بوون،هەتا هەندێکیان چاکترین جۆری ئۆتۆمبێلی لەژێردایە لە تازەترین مۆدیل بەلام مـن سـوپاس بۆخواپـشتم لەمانـە هەموی کرد،لەوکاتەی کە ڕاسـتیم زانـی،مـن ئێـستا بـژێوی خـۆم ومـاڵ ومنـداڵم لەڕێگەی کاری بازرگانی سەر بەرزانەوە دابین دەکەم.

لەم کتێبەدا چەند بابەتێکی دیاری کراوم باس کردووە،تـا هـەموو برایـانی خـۆم لەڕاستی ئاگادارین و،چـیتر پـەردە لەسـەر چـاوی هـیچ یـەکێکیان نـەمێنێ. لـە نیەتیشم دامەیە چەند کتێبێکـی ترکەپەیوەنـدی بەغـەیری ئـەم کتێبـەوە هەیـە بنوسم، تا هەموو موسڵمانان لەسەر بەڵگەبن وهیچ بەهانـەو بەڵگەیـەك بۆکەسـی گێل یان نەفام نەمێنێتەوە.

من دڵنیام کە ئەم کتێبـەم لەلایـەن فێرخـوازانی ڕاسـتیەوە پێـشوازیەکی باشـی لێـدەکرێت،کـە سـوپاس بۆخـوا ئـەوانیش زۆرن،بـەلام ئـەوەی ئـیتر بڕیـاری هەڵبـژاردنی گـومڕایی دا،تـا دەسـت کەوتـەکانی(موتـع)ە کـردن وپێـنج یـەکی لەدەسـت نەچـێ،ئەوانـەی کەعەمامـە دەنێنـە سـەریان و،سـواری(مارسـیدس)و(سـوپر)دەبـن، ئێمـە هـیچ قسەیەکمان لەگـەڵ ئەوانـەدا نیە،خوا بەسە بۆیان کـە لێپرسـینەوەیان لەگەڵدا بکـات لەسـەر ئـەو تاوانانـەی دەیکەن ‌« لە ڕۆژێك دا کە نەماڵ و نە منداڵ سودی نیـە جگـە لـەوەی بـەدڵێکی پاکـەوە دەچێتەوەلای خـوا.سوپاسـی ئەوخوایـە دەکـەین کـەڕێ نـویی کـردین بۆئەم کارە ، وەگەرنەو نەبوایە ئێمە هیچ کات ڕێنوییمان وەرنەدەگرت.

## عبدالله کوڕی سەبەء

لەلای ئێمەی دەستەی شیعە پێمان وایە کەسایەتی(عبدللە کوڕی سەبەء ) کەسایەتیەکی خەیاڵیەو،ئەهلی سوننە بۆتانەدان لەدژی شیعەو بیروباوەڕەکەیان دروستیان کردووە،کە گوایە ئەو شیعەی دروست کردووە ،تا بەمەخەڵکی لە شیعەو بیروبۆچونەکانی ئال وبەیت دورخەنەوە. جارێک پرسیارم لە بەڕێز(محمدالحسین کاشف الغطاء) کرد لە بارەی(کوڕی سەبەء ) لە وەلأمدا وتی:( عبدللەکوڕی سەبەء)ئەفسانەیەکە و ئەمەوی وعەباسییەکان لە ڕقی ئال وبەیت دایان ناوە، بۆیە پێویستە کەسی ژیرخۆی بەم کەسایەتییەوە سەرقاڵ نەکات،بەلأم هەرخۆی لە کتێبەکەیدا،ئەو کتێبەی کەنوسیویەتی بەناونیشانی (اصل الشیعة واصولها) لەلاپەڕە(٤٠-٤١)شتێکم بینییەوە،کە بەڵگەیە لەسەر بونی کەسێتی ئەم کەسە، لەو کتێبەدا نوسیویەتی کەدەڵێ: ئەو(عبداللە کوڕی سەبەء)ەی دەیدەنە پاڵ شیعە،یاشیعە دەدەنەپاڵ ئەو،ئەوە هەمو کتێبەکانی شیعە بە گشتی هەرهەمویان نەفرینی لێدەکەن وبێبەرین لەوکەسە).

وەگومان لەوەدا نیە کە ئەم نوسینە،دان نانە بە بونی ئەم کەسێتیەدا،کاتێکیش کەچومەوە بۆ لای وپێم وت کە تۆ شتێکی وات نوسیوە،لە وەلأمدا وتی: {ئاخرئەمەلەبەر(توقیە)*[1]،ئەوکتێبەی کەباسکرامەبەست پێی ئەهلی سوننەیە،هەر بۆیە لەپاش ئەم قسەیەم ئا ئەمەشم بەدوادا نوسیوە:ئەمەجگە لەوەی کەهیچ دورنیە ئەو کەسەی کەپێی وایە (عبدالله کوڕی سەبەء)

---

[1] *کارێکە نەیکەیت ونەیڵێی ،یابیکەیت وبیڵێی ،لەترسی خەڵکی وبۆچەواشەکردنیان شیعەر جولەکە ئەم سیفەتەیان زۆرە.

وهاوشێوەكانی هـەموی ئەفسانەیە، [illegible] ئەوكەسە لەدەدایان نـابێ كەكاتیان بەفیڕۆ ئەدەن. }

وە سەید(مرتضی العسكری)یش كتێبێكی داناوە بە ناونیشانی( عبد الله بـن سـبأ وأساطير أخرى) (عبداللەی كوڕی سەبەء وئەفسانەكانی تر)،لەو كتێبەدا نكوڵی لەبونی كەسایەتی(عبدالله)دەكات،هەروەك چۆن (سید محمد جواد مغنیة)ش لـە نوسـینی پێـشەكی بـۆ كتێبەكـەی (سیدمرتـضی) بـە هـەمان شـێوە نكـوڵی لەكەسایەتیەكەی دەكات.

(عبداللـەی كـوڕی سـەبەء) یەكێكـە لـەو هۆكارانـەی كەبۆتـە هـۆی ئـەوەی كەزۆرینـەی شـیعەكان ڕقیـان لەئـەهلی سـوننە بێتـەوە،گومـانیش لـەوەدا نیـە ئەوكەسـانەی لەئـەهلی سـوننە كەباسـی(عبداللـە)دەكـەن ژمارەیـان گـەلێك زۆرە،بـەلاَم شـیعە متمانـەیان پێناكـەن،چـونكەجیاوازن لەگەڵیانـدا. بـەلاَم گەرێمەكتێبە متمانە پێكراوەكانی بەردەستی خۆمان بخوێنینەوە ،دەبینین كـە (ابن سبأ )كەسایەتیەكی ڕاستەقینەیە،گەرچی هەندێ لەزاناكانیـشمان نكـوڵی لێبكەن. ئەمەش ڕونكردنەوەیەكە لەم بارەوە كە ڕاستێتی ئەمە دەسەلمێنێ:

١- لـە(ابـوجعفر)ەوە ڕەزای خـوای لێ بـێ دەڵـێ:(عبـدوڵلاَی كـوڕی سـەبەء) كەسـێك بـو بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتی دەكـرد،وەپێـی وابـو كـە پێـشەوای موسـڵمانان(مەبەسـتی عـەلی)ە،خوایـە (پـاك وبێگـەردی بۆخـوا)،وە ئەمـە گەیـشتەوە بـە پێـشەوای بـاوەڕداران،ڕەزای خـوای لێ بـێ،ئـەویش بـانگی كردوپرسـیاری لێكـرد،ئـەویش دانـی نابـەوەداو،وتـی:بـەڵێ تـۆ خوایـت،وە خراوەتەدڵمەوەو هەواڵم پێدراوە كـە تۆخوایـت ومنـیش پێغەمبـەرم، پێشەوای باوەڕدارانیش خـوا لێـی ڕازی بـێ وتـی:هـاوار بـۆ تـۆ بـە ڕاسـتی شـەیتان یـاری پێكردویـت،لـەم كارەپەشـیمان بـەرەوە دایكـت هـاوارت لەسـەربكا،ئـەویش

بنەماڵەی ئێوەو،پێشەوایەتی تۆو،بێبەری کردن لەدوژمنەکانت دەکات؟ ئیترئەوە بو ڕەوانەی (مەدائن)ی کرد وە هەندێ لە زانایان ئەوە دەگێڕنەوە کە (عبدالله)جولەکە بووە و دواترموسڵمان بووە،خۆشەویستی بۆعەلی دەربڕیوە،وە هەمان بۆچونی هەبووە لەسەردەمی جولەکایەتیدا بەرامبەر بە (یوشع بن نون) لەدوا موسا،لەئیسلامەتیشدا هەمان شتی بەرامبەر عەلی وتووە (واتە لەپاش پێغەمبەر ئەو شیاوی جێنشینایەتییە) ،(عبداللە) یەکەم کەسێك بو کە پێشەوایەتی عەلی(خوالیّ ی ڕازی بێت )بەفەرز داناو،بێبەری خۆی لەدوژمنەکانی ڕاگەیاندن....، هەر لێرەوەیە ئەوانەی پێچەوانەی شیعەن دەڵێن:کەبنەمای ڕەتکردنەوە (الرفض) لە جولەکەوە بوە. فرق الشیعة لا/٣٢-٤٤

*مەبەست لەمە ئەوەیە کە شیعە لەجولەکەوە دامەزراوە.

٤-(سعد بن عبداللەی ئەشعەری قومی) لەچوارچێوەی قسەکردنی لەسەر سەبەئیەکان دەڵێ: سەبەئیەکان شوێن کەوتوی (عبداللەبن سبأ) ن کەناوی (عبداللەی کوڕی وەهب ی ڕاسبی هەمدانی) یە،(عبداللەبن خرسی وابن اسود)،یاریدەدەری بون لەسەر بۆچونەکان،کە لە ناودارترین شوێن کەوتوانی بون،وە یەکەم کەس بو کە بە ئاشکرا تانە بدات لە (ابوبکر و عمر وعثمان) وخۆی لێیان بێبەری بکات المقالات والفرق لا/٢٠

٥- (الصدوق) دەڵێ: پێشەوای باوەڕداران خوالێی ڕازی بێت،دەیوت: هەرکەس لەئێوە گەر لە نوێژبووەوە بادەستەکانی بەرەوئاسمان بەرزبکاتەوەوبپاڕێتەوە،(عبدالله بن سبأ) وتی:ئەی پێشەوای باوەڕداران،ئایا مەگەر خوا لە هەموجێگەیەك نیە ؟وتی:بەڵێ،وتی:دەی ئیتربۆچی دەست بەرزیکرێتەوە بۆ ئاسمان؟پێی وت:بۆتۆئەم ئایەتەت نە خوێندۆتەوە (وَفِي

السَّمَاء رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ)الذاريات/٢٢،ئێوه بژێویتان و ئەوەشی پەیمانتان پێدراوه هەر له ئاسمانەوه دێت.دەی داواكردنی بژێویش هەر دەبێ له شوێنی خۆیەوه داوا بكرێت،كه شوێنەكەشی ئاسمانه .من لايحضرة الفقيه١/٢٢٩

٦- (ابن ابی الحدید)باس دەكات كه:جارێك عەلی وتاردەدات،(عبداللەبن سبأ) هەڵدەستێ وبه عەلی دەڵێ:تۆ،تۆ،ئەم وشەیەچەند باره دەكاتەوه،عەلی پێی دەڵێ:هاوار بۆ تۆ،من چیم وكێم؟ دەڵێ: تۆ خوایت،عەلیش فەرمان دەدات بەگرتنی و ئەوكەسانەش كه وا لەگەڵیدان وهەمان بۆچونیان هەیه. شرح نهج البلاغه٥/٥

٧-(سەید نعمة الله الجزائری):دەڵێ:(عبدالله)بە(عەلی) دەڵێ:تۆخوای بەڕاستیت،(عەلی)ش دەریدەكات بۆ(مەدائن)،وه دەڵێن:وەختی خۆی جولەكەبووەو، دواتر موسڵمان بووه،له سەردەمی جولەكەیشدا هەمان باوەڕی هەبووه لەبارەی (یوشع بن نون)و(موسا) دا الانوارالنعمانية م٢/٢٣٤

ئەمه حەوت دەق بو،كه له چەند سەرچاوەیەكی جیا جیاو،متمانه پێكراوەوه هێنامان،كه هەندێ لەو سەرچاوانه باسەكانیان تایبەته به (ژیاننامە)و،هەندێكیشیان بە(فیقە)و (دەستەوكۆمەڵەكان)ەوه، وه بۆیه لەسەرچاوه زۆرەكانی تریشەوه ئەمانەمان نەهێنا،لەبەرئەوەی زۆردرێژه به باسەكه نەدەین،كەئەوانیش هەمان ئەوبۆچونه دەسەلمێنن كه(عبدالله)كەسایەتیەكی ڕاستەقینەیه،كەواته ئیتر ناتوانین نكوڵی له بونی كەسایەتیەكی ئاوەها بكەین،بە تایبەت كەپێشەوای باوەڕداران(ڕەزای خوای لێبێت)سزای (عبدالله)ی داوه،لەسەر ئەوەی كەپێی وتووه:تۆخوایت،ئەمه به

واتـای ئەوەیـە کـە عـەلی ڕەزای خـوای لێ بـێ (عبداللـە)ی بینیـوە وبەیـەکتر گەیشتون،ئیتر ئەمە بۆخۆی بەسە کە وەك بەڵگە بەکاربهێنرێ و،کەواتـە نـاکرێ نکوڵی لەبونی وەهاشتێك بکرێ.

*واتە چۆن عەلی بەخوازانیوە ئەوانیشی هەربەخوازانیوە

ئەوەی لەودەقانەی ڕابرد و سودی لێوەردەگرین،ئەمانەن:

١-سـەلماندنی بـونی کەسـایەتی(عبـدالله بـن سـبأ)و هـەبونی دەسـتەیەك کـە یاریدەدەری بون وهەمان وتەو بۆچونی ئەویان وتووە وهەبووە،ئەم دەستەیەش ناسراوبون بە (سەبەئیەکان)

٢-(عبـدالله بـن سـبأ) سـەرەتاجولەکە بـووەو،پاشـان ئیـسلامەتی خـۆی ڕاگەیاندووە، ئەگەرچی ئیسلامەتی خۆشی ڕاگەیاندبو،بەڵام لـە ڕاسـتیدا لەسـەر جولەکایەتی خۆی مابۆوەو،بەناوی ئیسلامەوە ژەهرەکانی خۆی بڵاودەکردەوە.

٣-یەکەم کەس بووە کە تانەبدات لە (ابوبکر وعمر وعثمـان)و هـاوەڵان،ویەکـەم کەسـیش بـو کـە پێـی وابوعـەلی پێـشەوای باوەڕدارانـەوجێگرەوەی پێغەمبـەرە (صلى الله عليه وسلم)،وەئەم بۆچونەشی لەجولەکەیەتییەکەوە گواستۆتەوە،وە ئەمەشی تـەنها لەبەر خۆشەویستی بنەماڵەکردووە (بەگومانی خۆی)و بانگەشەی بۆ دۆستایەتی ئەوان کردووەو،بێ بەری لە دوژمنەکانیان،کـە بـە گومـانی خـۆی مەبەسـتی هـاوەڵان وئەوانەشـی دۆسـتایەتی ئـەمان دەکـەن. کەواتـە کەسایەتی(عبدالله)کەسایەتییەکی ڕاستەقینەیەو ناکرێ خۆی لێ گێل بکرێ،هـەر

السَّمَاء رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ)الذاريات/٢٢،ئێوه بژێویتان و ئەوەشی پەیمانتان پێدراوه هەر له ئاسمانەوه دێت.دەی داواکردنی بژێویش هەر دەبێ لە شوێنی خۆیەوه داوا بکرێت،کە شوێنەکەشی ئاسمانه .من لایحضرة الفقیه١/٢٢٩

٦- (ابن ابی الحدید)باس دەکات کە:جارێك عەلی وتاردەدات،(عبداللەبن سبأ) هەڵدەستێ وبه عەلی دەڵێ:تۆ،تۆ،ئەم وشەیەچەند بارە دەکاتەوە،عەلی پێی دەڵێ:هاوار بۆ تۆ،من چیم وکێم؟ دەڵێ: تۆ خوایت،عەلیش فەرمان دەدات بەگرتنی و ئەوکەسانەش کە وا لەگەڵیدان وهەمان بۆچونیان هەیە. شرح نهج البلاغه٥/٥

٧-(سەید نعمة اللە الجزائری):دەڵێ:(عبداللە)بە(عەلی) دەڵێ:تۆخوای بەڕاستیت،(عەلی)ش دەریدەکات بۆ(مەدائن)،وه دەڵێن:وەختی خۆی جولەکەبووەو، دواتر موسڵمان بووه،لە سەردەمی جولەکەیشدا هەمان باوەڕی هەبووه لەبارەی (یوشع بن نون)و(موسا) دا الانوارالنعمانیة م٢/٢٣٤

ئەمه حەوت دەق بو،کە له چەند سەرچاوەیەکی جیا جیاو،متمانە پێکراوەوه هێنامان،کە هەندێ لەو سەرچاوانە باسەکانیان تایبەتە بە (ژیاننامە)و،هەندێکیشیان بە(فیقە)و (دەستەوکۆمەڵەکان)ەوه، وه بۆیە لەسەرچاوه زۆرەکانی تریشەوه ئەمانەمان نەهێنا،لەبەرئەوەی زۆردرێژه بە باسەکە نەدەین،کەئەوانیش هەمان ئەوبۆچونە دەسەلمێنن کە(عبدالله)کەسایەتیەکی ڕاستەقینەیە،کەواتە ئیتر ناتوانین نکوڵی لە بونی کەسایەتیەکی ئاوەها بکەین،بە تایبەت کەپێشەوای باوەڕداران(ڕەزای خوای لێبێت)سزای (عبدالله)ی داوه،لەسەر ئەوەی کەپێی وتووه:تۆخوایت،ئەمە بە

واتـای ئەوەیـە کـە عـەلی ڕەزای خـوای لێ بـێ (عبداللـە)ی بینیـوە وبەیـەکتر گەیشتون،ئیتر ئەمە بۆخۆی بەسە کە وەك بەڵگە بەکاربهێنرێ و،کەواتـە نـاکرێ نکوڵی لەبونی وەهاشتێك بکرێ.

*واتە چۆن عەلی بەخوازانیوە ئەوانیشی هەربەخوازانیوە

ئەوەی لەودەقانەی ڕابرد و سودی لێوەردەگرین،ئەمانەن:

١-سـەلماندنی بـونی کەسـایەتی(عبـدالله بـن سـبأ)و هـەبونی دەسـتەیەك کـە یاریدەدەری بون وهەمان وتەو بۆچونی ئەویان وتووە وهەبووە،ئەم دەستەیەش ناسراوبون بە (سەبەئیەکان)

٢-(عبـدالله بـن سـبأ) سـەرەتاجولەکە بـووەو،پاشـان ئیـسلامەتی خـۆی ڕاگەیاندووە، ئەگەرچی ئیسلامەتی خۆشی ڕاگەیاندبو،بەلأم لـە ڕاسـتیدا لەسـەر جولەکایەتی خۆی مابۆوەو،بەناوی ئیسلامەوە ژەهرەکانی خۆی بلأودەکردەوە.

٣-یەکەم کەس بووە کە تانەبدات لە (ابوبکر وعمر وعثمـان)و هـاوەلأن،ویەکـەم کەسـیش بـو کـە پێـی وابوعـەلی پێشەوای باوەڕدارانـەوجێگرەوەی پێغەمبـەرە (صلی الله علیه وسلم)،وەئەم بۆچونەشی لەجولەکەیەتییەکەوە گواستۆتەوە،وە ئەمەشی تەنها لەبەر خۆشەویستی بنەماڵەکردووە (بەگومانی خۆی)و بانگەشەی بۆ دۆستایەتی ئەوان کردووەو،بێ بەری لە دوژمنەکانیان،کە بە گومـانی خـۆی مەبەسـتی هـاوەلأن وئەوانەشـی دۆسـتایەتی ئـەمان دەکـەن. کەواتـە کەسایەتی(عبدالله)کەسایەتییەکی ڕاستەقینەیەو ناکرێ خۆی لێ گێل بکرێ،هـەر

بۆیە بەدەق باسی لەنێو سەرچاوەو،کتێبە متمانە پێکراوەکانماندا هاتووە،وە بۆزیاتر زانیاری لەبارەی ئەم کەسایەتییەوە بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

| ناوی کتێب | ناوی دانەر |
|---|---|
| الغارات | ثەقەفی |
| الرجال | الطوسی |
| الرجال | الحلی |
| قاموس الرجال | التستری |
| دائرةالمعارف المسمات بمقتبس الاثر | الأعلمي الحائری |
| الكني والألقاب | عباس القمی |
| حل الاشكال | احمد بن طاوس سالی(٦٧٣)مردووه |
| الرجال | أبن داود |
| التحرير | الطاوسي |
| مجمع الرجال | القهبائي |
| نقدالرجال | التفرشي |
| جامع الرواة | المقدسي الأ ردبيلي |
| مناقب ال ابي طالب | ابن شهرأشوب |
| مرآة الانوار | محمدبن طاهرالعاملي |

ئەم سەرچاوانە تەنها وەك نمونە هێنامانەوە،دەنا زیاتر لە بیست سەرچاوە لەسەرچاوەکانی خۆمان،هەرهەمویان بەدەق باس لە کەسایەتی (عبدالله بن سەبەء) دەکەن،بەڵام ئەوەی جێی سەرسامییە ئەوەیە کە کەسانی وەك(مرتضى العسكري) و(سيدمحمدجواد مغنية) و کەسانی ترجگە لەم دوانە لە زانایانمان،ئەوەیە کە نکوڵی لەکەسایەتی ئەم کەسە دەکەن،گومانیشی تێدانییە کە قسەی ئەمانە هیچ ڕاستیەکی تێدانیە.

## ڕاستییەتی درانە پاڵی شیعە بۆ ئالو بەیت:

ئەوەی کەبڵاوە لەلای ئێمەی گرۆهی شیعەکان،ئەوەیە کە ئێمە بە تایبەتی لەئال وبەیتین،مەزهەبی شیعەکان هەرهەموی لەسەر خۆشەویستی بۆئال وبەیت، ڕاوەستاوە (بەبۆچونی خۆمان) ،چونکە دۆستایەتی ودوژمنایەتی (الولاء والبراء ) ئێمە لەگەڵ ڕەشەخەڵکەکە (کەئەهلی سوننەن) بەهۆی ئال وبەیتەوەیە، وخۆبێبەری کردنە لە هاوەڵان،لە پێشەنگی ئەمانەشەوە خۆبێ بەری کردنە لەسێ خەلیفەکەی ترو،(عائیشەی کچی ابوبکر)،ئەوەی کەلەمێشکی هەموشیعەکان دا چەسپاوە و ڕەگی داکوتیوە،بە گەورە و بچوکیانەوە،بە زاناو نەزانیانەوە، بە نێرومێیانەوە،ئەوەیەکەپێیان وایە،سەحابەکان ستەمیان لەئال وبەیت کردوەو،خوێنیان ڕژاندون و،شەرەف وناموسیان حەڵاڵ کردون.هەروەها سوننەکان دوژمنایەتی خۆیان ڕاگەیاندووە بەرامبەر ئال وبەیت،هەربۆیەکەس لەئێمە دودڵ نییە کاتێ بە سوننەکان دەوترێ (نواصب)،وە بەبەردەوام بیرلەخوێنی (حسین)ی شەهید دەکەینەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)،بەڵام کتێبە متمانە پێکراوەکانی خۆمان ڕاستی ئەم کارەمان بۆدەخەنەڕو،کاتێ کەچۆن ئال وبەیت بێزاری خۆیان لەو کەسانە دەردەبڕن کەخۆیان بەدۆستیان

دەزانن،وەچۆن کتێبەکانمان باسی ئەوکارانەمان بۆدەکەن کە دۆستەکانی ئاڵ وبەیت چی بەئاڵ وبەیت دەکەن،وە بۆمان باس دەکەن کەچۆن خوێنی ئاڵ وبەیت خۆیان دەبڕێژن ،وەکێش بووە هۆی کوشتنیان وحەلاڵکردنی شەرەف و ناموسیان.

پێشەوای باوەڕداران (ڕەزای خوای لێ بێ)دەڵێ: گەردۆست ولایەنگران جیا بکەمەوە،کەسیان نابینم کە ڕاست بکەن جگە لەوەی کەتەنها بەدەم ستایش دەکەن،وەگەر تاقیان بکەمەوە،بەهەڵگەڕاوەیی دەیان بینم،وەگەر پاکژیان بکەم لەهەزاریان دانەیەکیانم بۆپاکژناکرێ.          الکافی/الروضة ٣٣٨/٨

وە هەروەها دەڵێ:ئەی ئەوانەی کە پیاونین،بەڵکوسێبەری پیاون،ئەوانەی کەخەیاڵی منالانتان هەیە،ئەی ئەوانەی عەقڵتان وەك عەقڵی کەوبەخێوکارە،خۆزگە ئێوەم نەدەدی ونەمدەناسین،سوێند بە خوا لە پەشیمانیداخەریکە دەبم بە دو لەتەوەویەکالادەبمەوە،خوابتان کوژێ،دڵی منتان پڕلە کێم وزوخاوکردووە،سنگمتان پڕکردووە لەکینەو،بیروهۆشتان خراپ کردوم بەهۆی سەرپێچی کردن وسەرشۆڕییەوە،هەتا ئەوەتا (قورەیش) دەڵێن:کوڕەکەی أبوطالب بەڕاستی ئازایە،بەلام زانیاری چاکی نییە،بەلام کەسێك بەگوێی نەکرێ،قسەو بۆچونیشی نرخی نییە)   نهج البلاغة ٧٠-٧١

وە سەرزەنشتیان دەکات وپێیان دەڵێ:بەسێ و،دوشت بەهۆی ئێوەوە لاوازبوم:کەڕی خاوەن گوێن،لاڵی خاوەن زمانن،کوێری خاوەن چاون،لەکاتی جەنگدا نە ئازادن نە ڕاستگۆ،لەکاتی ناخۆشیدا برای متماندارنین....،وەك چۆن

ئافرەت لەشی بەرەڵا دەکات ورووتی دەکات،ئێوەش ئاوەهالێم دورکەوتنەوە)
نهج البلاغة لا/١٤٢

ئەمە لە کاتێکدا ئەمەی پێ وتن،کاتێ کەئەوان ناپاکییان لەگەڵدا کردو،بونەمایەی تەریقی بۆپێشەوای باوەڕداران، وەپێشەوا عەلی وتەی زۆری لەسەر ئائەمانە هەیە.

پێشەوا (حسین کوڕی عەلی) لەدوعایەکی دا کە لە دۆست ولایەنگرانی دەکات، دەڵێ: (اللهم ان متعتهم الی حین ففرقهم فرقا،وجعلهم طرائق قدداً ،ولاترض الولاة عنهم أبدا،فانهم دعونالینصرونا،ثم عدواعلینافقتلونا) الارشاد للمفید لا/٢٤١

ئەی خوایە گەر تا ماوەیەکیش مۆڵەتیان دەدەی ڕابوێرن، ئەوا پەرتەوازەیان بکە وبیان کە بە چەندین کۆمەڵ وڕێگەی جیا جیاو،هەتا هەتایە دەسەلآتدارانیان لێ ڕازی مەکە،چونکەبەڕاستی ئەمانە ئێمەیان بانگ کرد تا یارمەتیمان بدەن،بەلآم ئەوان لەدوای ئەمە دەست درێژیان کردەسەرمان و کوشتاریان کردین.

وەجارێکی تر دەیاندوێنێ ودوعایان لێدەکات، لەبەشێکیا دەڵێ:(بەلآم ئێوە زۆر بە خێرایی پەیمانتان داینێ،وەك خێرایی گەورەبونی کولەکە وە بلآوبونەوە وەك بلآوبونەوەی پەپولە،پاشان پەیمانەکەتان هەڵوەشاندەوە،وەك نەزانی ودوری، وسەرشۆڕی بۆملهوڕانی ئەم ئوممەتەو،چاولێکەرانی گروپ ودەستەوتاقمەکان و،وازهێنانتان لە قورئان ،پاشان تەنها ئێوە ئێمەتان سەرشۆڕکرد،کوشتارتان کردین،نەفرینی خوالەستەمکاران) الاحتجاج ٢/٢٤

ئەم دەقانە زۆر بەڕونی دەری دەخات کە بکوژانی ڕاستەقینەی (حسین)کێ بون،ئەو کەسانەبون کەشوێنکەوتەوخۆیان بەپشتیوانی دەزانی لەشاری (کوفە)دا،واتە: باوانی ئێمەبون،ئیتربۆ چی بەرپرسیاریتی کوشتنی (حسین)بخەینەئەستۆی سوننەکان؟؟

هەر لەبەر ئەمەیە (سیدمحسن الامین) دەڵی:(بیست هەزارکەس لەخەڵکی عێراق، پەیمانیاندا بە حسین،بەلآم دواتر غەدرو ناپاکیان لەبەرامبەردا کردو،دژی وەستان،لە کاتێکدا پەیمانی (حسین) لەگەردنیاندابو،کەچی ئەوان لەناویان بردوکوشتیان) اعیان الشیعة،بەشی یەکەم لا/٣٤

*(حەسەن)خوالێی ڕازی بێت دەڵێ:(سوێند بەخوامن (معاویە) بە باشتر دەزانم بۆمن،وەك لەمانە،ئەمانە بەگومانی خۆیان وادەزانن،پشت ویارمەتیدەری منن،بەلآم بەدوای کوشتنم دادەگەڕێن،ومالّم دەبەن،سوێند بە خواگەر لەگەلّ (معاویە) پێك بێم،تاخوێنمی پێ بپارێزم ولەناومالّ وخێزان ومندالّی خۆمدا بەهێمنی بژیم،لەوە باشترە ئەمانە بمکوژن،ئەوکات کەس وکارەکەم لەدەست بچێ،سوێندبێت گەر بهاتایەو شەڕم لەگەلّ معاویە بکردایە،هەر ئەمانە خۆیان دەهاتن ودەیانگرتم وبەزیندویی دەیاندامە دەست معاویە،سوێند بە خوا گەر ئێستامن ئاشتەوایی لەگەلّ معاویەدابکەم بە سەربەرزیەوە،ئەمەم پێ چاکترە تائەوەی بەدیلی بم کوژێ) الاحتجاج ٢/١٠

پێشەوا (زین العابدین)خوالّ ی ڕازی بێ،بە خەڵکی کوفە دەڵێ:(ئایادەزانن کەهەرئێوەبون،نامەتان بۆباوکم نوسی وهەڵتان خەڵەتاند،پەیمان وبەڵێنتان دایەو،دواتر کوشتارتان کردو تەریقیتان بەسەردا هێنا،بەچ چاو و

ڕویەکەوەسەیری پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)دەکەن،گەڕیێی وتن: نەوەکەی منتان کوشت و،ڕێزی منتان شکاند،ئێوە لەئوممەتی من نین).
الاحتجاج ٢/٣٢

*هەر لەبارەیانەوە دەڵێ:(ئەوانە بۆئێمە دەگرین،بەلآم جگە لەوان کێ کوشتاری کردین) ؟. الاحتجاج ٢/٢٩

*(باقر) ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ:ئەگەر هەمو خەڵکی ببنە شیعەو دەستەی ئێمە،ئەواسێ لەسەرچواریان خەڵکی گومانـاوین و،یەك لەسەرچوارەکەی تریشیان(کەودەن)وبێ عەقڵن رجال الکشی ص٧٩.

*(صادق) خوالێی ڕازی بێ دەڵێ:سوێند بەخوا، گەر لەناوتاندا سێ کەسی باوەڕدار ببینمەوە،کەقسەکانم نابەن بۆخەڵکی،ئەوکاتە بەڕەوام نەدەزانی هیچ قسەیەکیان لێ بشارمەوە) اصول الکافی ١/٤٩٦

*(فاطمة الصغری) سەلامی لەسەر،لەوتارێکیا بۆخەڵکی کوفە دەڵێ (ئەی خەڵکی کوفە،ئەی ئەهلی ناپاکی و،فێڵ و،خۆبەزل زان،ئێمەی ئەهلی بەیت،خوا بە ئێوەی تاقی کردینەوە،ئێوەشی بەئێمە تاقی کردەوە،تاقیکردنەوەکەی ئێمەی بەباشە گەڕان...،بەلآم ئێوە بێباوەڕیتان کردپێمان و،بەدرۆتان خستینەوە،کوشتاری ئێمەتان بە ڕەوا زانیو،ماڵی ئێمەتان دزی،هەروەك چۆن دوێنێ باپیرەی ئێمەتان کوشت و،شمشێرەکانتان خوێنی ئێمەی ئەهلی بەیتی لێ دەچۆڕێ. دوری و دەست شکاوی بۆ ئێوە چاوەڕوانی نەفرین و سزا بن،هاکا گەیشتە سەرتان وهەندێ لەوسزایەی کەهەتاهەتایی هەتا نە لە دوا ڕۆژدا بیچێژن،بەهۆی ئەوستەمەی لەئێمەتان کرد،نەفرینی خوا لە ستەمکاران

بێت،دوری ودەست شکاوی بۆنێوەئەی خەڵکی کوفە،چەندە باسی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)یان خوێندۆتەوە ئەوانەی پێش خۆتان،پاشان ناچاکیتان بەرامبەرعلی بن أبی طالب برای و،باپیرم ونەوەکانی و،بنەماڵەپاکەکانی کرد.

جایەکێکی (منگن) لەخەڵکی کوفە هەستا وەڵامی دایەوەو وتی:ئێمەعەلی ونەوەکانیمان کوشت،بە شمشێری هیندی و،رم و،ئافرەتاکانیشیانمان،وەك ئافرەتانی تورك کردە دەست کەوت وبە هەموجۆرێ قۆچمان لێدان(مەبەستی جوت بونە لەگەڵیاندا). الاحتجاج ٢/٢٨

(زەینەب) ی کچی پێشەوای باوەڕداران،وەك سەرزەنشتێك بەخەڵکی کوفە دەڵێ:لەپاش ئەمەئەی خەڵکی کوفە،ئەی ئەهلی فێلْ وناپاکی وسەرشۆڕی، نمونەی ئێوە وەك ئەوئافرەتە وەهایە کەپاش هۆنینەوەی خوریەکەی دەچو هەڵیدەوەشاندەوە،ئێوەجگە لە کەسی بێزراوو لە خۆبایی وخراپ ودرۆزن،مەگەر چ کەسێکی ترتان تێدا هەیە،بۆ براکەم دەگرین؟ بەڵێ زۆر بگرین وکەم پێ بکەنن،سوێند بە خوا ئێوە بەهۆی عەیبدارکردنی ، تاقی کرانەوە ،ئێوەکوشتنی زنجیرەی کۆتاپێغەمبەرتان بێ نرخ وبێ بەهادانا) الإحتجا ج ٢/ ٢٩-٣٠

لەم دەقانەی کە هێنامان (وە زۆرێك لەدەقەکانی ترنەمان هێنان)ئەم سودانەی لێوەردەگرین:

١-بێزاری وبێ تاقەتی پێشەوای باوەڕداران ونەوەکانی،لەدەست گروپ ودەستەو تاقمەکەی لەخەڵکی کوفە،بەهۆی ناپاکی وفێڵ وسەرشۆڕی کردنیان بەرامبەریان.

٢-سەرشۆڕی وناپاکی کردنی خەڵکی کوفە،بووە هۆکاری ڕژانی خوێنی ئەهلی بەیت و،ڕەوابینرانی ناموسیان.

٣-ئەهلی بەیت بەرپرسیارێتی کوشتنی حوسێن وهاوەڵانی دەخەنە ئەستۆی شیعەو،یاریدەدەرانیان،هەتایەك لەوانە دان بەوەدا دەنێ،لەبەردەم (فاطمةالصغری)دا،کە بەڵێ ئەوان عەلی ونەوەکانیان کوشتووەو،ئافرەتەکانیشیانیان کردۆتە دەست کەوت وەك لەپێشەوە باسمان کرد.

٤-ئەهلی بەیت دوعا لەشوێن کەوتووەکانیان دەکەن و،وەسفیان دەکەن بەوەی کەملهوڕی ئەم ئوممەتەن و،پاشکۆو جێماوی گروپ ودەستەوتاقمەکانی ترن و،قورئانیان وەلاناوە،زیاد لەمانە نەفرینیان بۆدەنێرن؛هەرلەبەر ئەمەیەدێن بۆلای(ابوعبدالله)ڕەزای خوای لەسەر،پێی دەڵێن:ئێمە ئەو پەیمانەی کەکۆڵمانی قورس کردبو ،فڕێماندا،دڵمان بەرامبەری مردووە،دەسەلاتداران خوێنیان حەلاڵ کردوین).لە فەرمودەیەکیاندا کەزاناکانیان بۆیان گێڕاونەتەوە،پاشان (ابوعبالله) سلاوی لەسەردەلێ:مەبەستان ئەوەیە پێتان دەڵێن:ڕافیزە؟ وتیان:بەلێ،وتی:سوێند بە خوا ئەوان ناوەیان لەئێوە نەناوە.............، بەڵکوخوائەوناوەی لەئێوەناوە) الکافی ٥/٣٤

ئەوەتا (ابوعبدالله) بۆیان ڕوون دەکاتەوە کەخواناوی ناون(ڕافیـزە)،نـەك ئـەهلی سوننەکان.

بەڕاستی ئـەم دەقانـەم چـەندین جارخوێنـدەوەو،زۆربـیرم لێدەکردنەوەو،لەئەرشیفی تایبەتی خۆمـا دام نـان،چـەندەها سـەرنجم لێ دەدان ،لەم دەقانەو،چەندەها دەقی تری لەم شێوەیە،بۆیە بـێ ئـەوەی ئاگـام لـەخۆم بێ،بـەدەنگێکی بـەرز وتم،بەڕاستی هەرخوایارمـەتی دەرتـان بـووە،ئـەی ئـال وبـەیت،لـە بەرامبـەر ئـەو هـەمو ناڕەحەتیـەی کەتوشـتان بـووە،لەلایـەن لایەنگرانتانەوە.

هەمومان چاك دەزانین کەپێغەمبەران،سەلامی خوایان لەسـەر،توشـی چ ئازارێك هاتون لەلایـەن هۆزەکانیانـەوە،وە پێغەمبـەری خۆشمـان( صـلـى الله علیـه وسـلـم ) هـەروەها،بـەلام مـن بـەش بـەحالی خـۆم سەرسـامم بـە دوڕوداو،لـە(موسـا)سـەلامی لەسـەر،کەچـۆن ئـارامی گـرت لەگـەل (بنـی اسرائیل)دا،بۆیە دەبینی قورئان ،زیاترباسی ئەوی کـردووە،وەك لەپێغەمبـەرانی تـر،وە ڕونـی دەکاتـەوە کەچـۆن ئـارامی گرتـووە،لەسـەر ئـەو هـەمو ئـازارە زۆرو،فرووفێلَ و،پیلانانەی ،بنی اسرائیل.

وە سەرسامم بە (ئەهلی بـەیت)سـەلامی خوایـان لێ بـێ،کەچـۆن ئارامیـان گـرت لەسـەر ئـەو هـەموئازارەی کـەبینیان لەخـەڵکی (کوفـە)،وە چـەند خـۆ ڕاگریـان گەورەبو،لە بەرامبەرخەڵکی کوفە،کە بنکەومەڵبەندی شیعەیە،کە چۆن ناپاکیان لەگەڵیانـدا کردوکوشـتاریان کـردن و،ماڵیـان بـەتالان بـردن،کەچـی لەگـەل هەموئەمانەش دا،ئێمەدێین سەرزەنشتی سوننەکان دەکەین وئـەوان بەبـەرپرس دەزانین.

کـــاتێ کەپەرتوکەمتمانـــەپێکراوەکانمان دەخوێنینـــەوە شـــتی زۆر ســـەیرو ســـەمەرە،دەبیـنین،لەوانەیـە کـەسمان باوەڕنەکـەین ئەگـەریلێین:بەڕاسـتی کتێبەکانمان،ئەی گرۆهی شیعە،تانە لە ئەهلی بەیت دەدات،تانـە لـە پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) دەدات،

بۆنمونە: لەئـەمیری ئیمانداارانـەوە دەڵـێ:(غـەفیر ،کـە گوێدرێژەکـەی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم)بو،بە پێغەمبەری وتـووە:دایـك وبـاوکم بەفیـدات بـێ،ئـەی پێغەمبەر،باوکم لەباوکیەوە،لە باپیریەوە،ئەویش لە باوکیەوە بۆی گێڕاوەمەتـەوە کە: لە کەشتیەکەدا لەگەڵ (نوح)دا دەبێ،نوح دەچێ بۆلای ودەسـتێك دەهێنـێ بەسەر پـشتەقنگیاو،پاشـان دەڵـێ:لەپـشتی ئائـەم گوێدرێـژە،گوێدرێـژێك دێتـە دنیاوە،سەرگەورەو،کۆتا هێنەری پێغەمبەران،سواری دەبێ،دوایـی گوێدرێژەکـە دەڵـێ: سـوپاس بۆئەوخوایـەی کـەمنی دانـاوە بـەو گوێدرێـژە) اصـول الکـافی ٢٣٧/١

ئەم گێڕانەوەیەئەم شتانەی لێوەردەگیرێ:

١-گوێدرێژ قسەدەکات.

٢-گوێدرێژەکە،گفت وگۆی لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردووەو،پـێ ی وتــووە:دایــك وبــاوکم فیــدات بــێ،لەگــەڵ ئــەوەی دەزانــین،کــە ئــەوە موسڵمانانن،دایك وباوکیان دەکەنە فیدا بۆ پێغەمبەر،نەك (گوێدرێژ).

٣-کەرەکـــە،دەڵـــێ:بـــاوکم لـــە باپیرەـــەوە تابـــاپیرەی چـــوارەم بـــۆی گێڕامەوە،مەعلومیشە کـە نێـوان (نـوح) و (محمـد)هـەزاران سـاڵیان بەینـە،دەی ئـەوەتا دەبیـنین،بەقـسەی گوێدرێژەکـەبێ،بـاپیرەی چـوارەمی لەگـەڵ نـوح لـە کەشتیەکەدا بووە،جارێکیان لەگەڵ هەندێ قوتـابی (حـەوزەی نەجـەف) کتێبـی (اصول الکافی)مان،لەلای (امام خوئی) دەخوێند،تا لەم جێگەیەدا،ئیمـام خـوئی

دەڵێ:سەیری ئەم موعجیزەیە بکەن،ئەوەتا نوح بە هەزاران ساڵ پێش لەدایك بوونی(محمد)هەواڵی لەدایك بوونی دەدا.

ئـــەم قـــسانەی (ئیمـــام خـــوئی)،چـــەند جارێـــك بۆماوەیـــەك لەگوێمـــدا دەزرنگایەوە،ولـەدڵی خۆمدا دەمـوت:ئاخرچـۆن دەبـێ ئەمـە مـوعجیزەبێ،کـە گوێدرێژێ، بەپێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بڵێ:دایك وباوکم فیدات بێ؟چـۆن دەگونجێ بۆکەسێکی پێشەوای باوەڕداران (عەلی) سەلامی لەسەر،ئەم جـۆرە گێڕانەوانە ڕاگوێز بکا؟

بەڵام منیش وەك ئەوانی تریێدەنگیم هەڵبژارد.

٤–لەسەر ئایەتی(واذ تقول للذی انعم الله علیه وانعمت علیـه امسك علیـك زوجـك واتقی الله وتخفی فـی نفسك مـاالله مبدیـه) الاحـزاب/٣٧ (صـدوق) لـە (رضـا)وە وتەیەکی باس دەکات کە (رضا) لەسەر ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەڵێ:پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەرەوماڵی (زید بن حارثة )دەچێ،بەمەبەستی کارێك،کەدەچـێ دەبینـێ وا (زینـب)ی ژنـی (زیـد) خـۆی دەشـوات،پێغەمبـەر کـە ئەمـە دەبینـێ دەڵـێ:پـاك وبێگـەردی بۆئەوخوایـەی کەدروسـتی کردویـت. عیـون اخبـار رضـا ص١١٣.

ئایا پێغەمبەر سەیری خێزانی پیاوێکی موسڵمان دەکات وئارەزوی بچێتە سەری و،پێی سەرسام بێ و،پێی بڵێ:سبحان الـذی خلقك؟ئایـا ئەمـە تانـەدان نییـە لـە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)؟

لەئەمیری ئیماندارانەوە،جارێك دەچێ بـۆلای پێغەمبـەر(صـلی الله علیـه وسـلم ) ،لەو کاتەدا(ابـوبکر)و(عمـر)لـە لای دەبـن،دەڵـێ:منـیش کـە چـومە ئـەوێ،چـوم لەنێوان پێغەمبەرو عائیشەدا،دانیشتم،عائیشەش دەڵـێ:ئـەوە هـیچ جێگەیـەکت

نەدێیەوە،تەنهاڕانی من وپێغەمبەر نەبێ؟ پێغەمبەریش دەڵێ:لەسەرخۆ ئەی عائیشە). البرهان فی تفسیرالقران ٤/٢٢٥

٥-وە جارێکی تر (عەلی) دەچێت بۆلای پێغەمبەر،کە دەبینێ جێگانییە،پێغەمبەریش ئاماژەی بۆدەکات کە لە ئانێرەدا دابنیشە،واتە لە پشتیەوە،عائیشەش لەپشت پێغەمبەرەوە دەبێت،پۆشاکێکی لە بەردایەو بە پێوەیە،پاشان کەعەلی دێت،لەنێوان پێغەمبەروعائیشەدا،دادەنیشێ،عائیشە بە تورەبونەوە دەڵێ،هیچ جێگەیەکت بۆ قنگت نەدۆزیەوە،کۆشتی من نەبێت؟ ئیتر پێغەمبەر لە عائیشە تورەدەبێ ودەڵێ:ئەی حومەیرا؛ لەبارەی عەلی برامەوە ئازار بەدڵم مەگەیەنە). کتاب سلیم بن قیس ص١٧٩

٦- (المجلسی) دەگێڕێتەوە،کەپێشەوای باوەڕدازان وتویەتی:لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله علیه وسلم)سەفەرم کرد،جگە لەمن خزمەتکاری تری نەبو،وە لێفەیەکی هەبو،کەجگەلەوە هیچی تری نەبو،لەوسەفەرەداعائیشەشی لەگەڵدابو،وەپێغەمبەر لەنێوان من وعائیشەدا دەنوست،ئەم سێیانەمان جگە لەولێفەیە،هیچی ترمان پێوە نەبو ،جائەگەر پێغەمبەر هەڵ بستایە بۆ شەونوێژ،بەدەستی لێفەکەی لەنێوان من وعائیشەدا،دەنیشان، بە جۆرێ،کەلێفەکە بەر ڕاخەرەکەی ژێرمان دەکەوت. بحارالانوار ٤٠/٣

ئایاپێغەمبەر ڕازی بووە،کەعەلی لەسەرکۆشی عائیشەی خێزانی دانیشێ؟ ئایاچۆن پێغەمبەرغیرە ناکات لەهاوسەروهاوبەشی ژیانی،کاتێ بەتەنیا لەگەڵ ئامۆزاکەی خۆیدا لەیەك جێگادا بەجێی بهێڵێ،کە بێگومان عەلی نامەحرەمە؟پاشان ئەی چۆن کەسێکی وەك عەلی بەمە ڕازی دەبێ؟

*سەید(عەلی غەرەوی)کەیەکێکە لە زانا گەورەکانی حەوزە،دەیڵێت: دەبێ (ذکر)ی پێغەمبەر بخرێتە دۆزەخەوە،چونکە لەگەڵ هەندێ ئافرەتی موشریك

داسەرجێ یی کردووە) ،مەبەستی لەم قسەیەی (عائشە وحفصة)ی خێزانـەکانی پێغەمبـەرە،ئـەم قـسەیە مەعلومـە کـەبێ ئـەدەبی و،نامـاقوڵی یـە،بەرامبـەر بـە پێغەمبـەر،چـونکە ئەگـەر(ذکر)ی پێغەمبـەر بخرێتـە دۆزەخـەوە،کەواتـە قـەت ناچێتە بەهەشتەوە.

بەم شەش گێڕانەوانـە کـە پەیوەسـت بـون بـە پێغەمبـەرەوە،وازدێـنم،تـا بـچمە سەرهەندێ گێڕانەوەی تر.

لـەبارەی پێـشەوای بـاوەڕداران(عـەلی)چـەندین گێڕانـەوەیان هێنـاوە کـە ئەمـە هەندێکیانە:

(ابوعبدالله)،رەزای خوای لەسەر،دەڵێ:عومەر،ئـافرەتێکی هێنـابۆلای علـی،ئـەم ئافرەتەپیاوێکی ئەنصاری خۆش دەویست،جا عمر هێلکەیەکی شکاندو،سپێنەی هێلکەکەی دالەنێوان هـەردوڕانی ئافرەتەکەوجلـەکانی،کـاتێ کـەدەیهێنێ،بـۆلای علی وەك تۆمەتبار،کە گوایە داوێن پیسی کـردووە،عـەلی دەچـێ سـەیری نێـوان هەردوڕانی ئافرەتە کەدەکات ،ئیتر کەئـەو لینجیـە دەبینـێ،تۆمـەتباری دەکـات بەکاری داوێن پیسی یەوە). بحارالانوار ٣٠٢/٤

ئێمەدەپرسین:ئایاپێشەوای باوەڕداران سـەیری نێـوان ڕانـی ئـافرەتێکی بێگانـە دەکات؟ئاخرعەقڵ شتی واقبوڵ دەکات،کەامامی (صادق) واتە (ابوعبدالله) ئـەم هەواڵە بگێڕێتەوە؟ ئاخرکەسێ ئەهلی بەیتی خۆش بوێ قسەی وادەکات؟

(ابوعبداللـە) ڕەزای خـوای لی بێ، دەڵـێ:جارێـك پێـشەوای بـاوەڕداران لەسـەر مینبەرەکە دەبێ،ئافرەتێکی ناشرین وخراپ هەڵدەستێ وبە (علـی) دەڵـێ:ئـەی بکوژی خۆشەویستان،عەلیش سەیرێکی دەکات وپێی دەڵێ(ئەی دەمەوەر،ئـەی چاونەترس،ئەی دەم پیس،ئەی ئەوکەسـەی کـەخۆت وەك پیـاوڵێ دەکـەی،ئـەی

ئـەو ئافرەتـەی کـەوەك ئافرەتـان سـوڕی مانگانـە نـابیتی،ئـەی ئەوکەسـەی بەسەر(عەورەت)یەوەشتێك هەیە شۆڕبۆتەوە). البحار ٢٩٣/٤١

ئایاپێشەوای باوەڕداران ئەم قسە ناشرینانە دەکات؟ئایا بە ئافرەتێك دەڵێ: ئەی ئەوکەسەی بەسەر(عـەورەت)یـەوە شتێك هەیـە شۆڕ بۆتـەوە؟ ئایا امام صادق (ابوعبدالله) دەگونجێ ئەم قسەبێ بایەخ وپوچـانە بگێڕێتـەوە؟ سـوێند بەخوا گەرئەم جۆرە گێڕانەوە لەسەرچاوەوکتێبی سوننەکان دابوایە،دونیامـان لێ هەڵدەستاندن و،بـەهیچ جۆر بێدەنگ نـەدەبوین و،ڕسـوامان دەکردن،بـەلام ئەمە لەکتێبەکانی ئێمەی شیعەدایە!!

*لەکتێبی (الاحتجاج)ی طبرسی داهەیەکە:(جارێك فاطمة،بەپێشەوای باوەڕداران (عـەلی)دەڵـێ:ئـەی کوڕەکـەی ابوطالـب،تـۆ وەك منداڵـەکانی تـر،وێلاشـت نـەبوەو،لـەژوری گومانـاویـا دانیـشتوی).هـەروەها(طبرسـی) لەهـەمان کتێبـدا دەگێڕێتەوە:(جارێك عومەروکەسێکی تر کە لەگەڵ عومەردا بووە،بەپەت کـراوی (عەلی) دەهێنن بۆلای ابوبکر، بە ڕاکێشان وپەتێکی لەملدا دەبێ،کەدەگاتـە لای ابوبکر،عەلی هاواردەکات ودەڵێ:ئەم خەڵکە چەوساندویانمەتەوەو،خـەریك بـوبم کوژن).

ئێمە دەپرسین ئایاپێشەوای باوەڕداران (عـەلی) تائـەم ئەندازەیـە ئـاوا ترسنۆك بووە؟

*بـڕوانن چـۆن پێناسـەی (ئـەمیری ئیمانـداران ) دەکـەن و،(فاطمـة) لـەبارەی (عەلی)ەوەدەڵێ:ئافرەتـانی قـورەیش لـەبارەی (عـەلی)ەوە،بۆیـان بـاس کـردوم کەعەلی بەم جۆرەیە:پیاوێکی ورگنی بچکۆلەیە،.باڵ درێـژە ،نێـوان جومگـەکانی ئەستورن،ئەم لاولای قژی ڕوتاوەیە،نێوچەوانی هەڵتۆقیو وقۆقزە،نێوشـانەکانی پانە،چاوشڵەقاوە). مقاتل الطالبین. ص٢٧

ئایا ئەمەیە وەسفی پێشەوای باوەڕداران،ڕەزای خوای لێ بێ؟؟

بەم ئەندازەیەش لەم بارەوە کۆتایی دێنین،ئێستاش دەچین باسی ئەوگێڕانەوانە دەکەین کەپەیوەندیان بە(فاطمة)وە هەیە سەلامی لەسەر.

(ابوجعفرالکلینی) لە کتێبی (اصول الکافی)دا دەگێڕێتەوە کە: (فاطمة،یەخەی عومەر دەگرێت و،ڕایدەکێشێت بۆلای خۆی).

وە لە کتێبی(کتاب سلیم بن قیس)دا هاتووە کە:(فاطمة،سەلامی لەسەر،لەبارەی دەست کەوتی(فدك)ەوە دەچێت بۆلای ابوبکروعومەر،لەوێ دەبێتە دەمەبۆڵەو،شەڕەقسە لەگەڵیان داو،لەنێوخەڵکەکەدا دەست دەکات بەهاوار و قسەکردن و،خەڵك لێ ی کۆدەبنەوە). لا ٢٥٣

ئاخۆ دەبێ (فاطمة) ئەوەندە خراپ بوبێ،تائەم کارە بکات؟

(الکلینی) لەکتێبی (الفروع) دەگێڕێتەوە کە:فاطمة،سەلامی خوای لەسەر،پێی خۆش نەبووە کەشوبە عەلی بکات،کاتێ باوکی دەچێتە ژورەوەبۆلای(فاطمة)دەبینێ(فاطمة)دەگری،پێی دەڵێ:چی دەت گریەنێ؟ سوێند بەخوا ئەگەر لەنێو کەس وکارەکەم دا،چاکترم لەعەلی شك بردایە،ئەوانەم دەدایت بەعەلی،وە سوێند بە خوا،من تۆم نەداوە بە شو،بەڵکوخوای گەورە تۆی داوە بەشو،وەکاتێکیش کەباوکی دەچێت بۆلای ونوێنەرەکەی خۆی لەگەڵدا دەبێ،کاتێ کە (فاطمة) باوکی دەبینێ،فرمێسك لەچاوەکانی دەبارێ،باوکی پێی دەڵێ:کچەکەم بۆدەگری؟ دەڵێ:لەبەر کەمی خۆراك و،غەم وخەفەتی زۆر)،لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێ:سوێند بە خوا، بێتاقەتی ودڵگرانی و،نەبونی و،نەخۆشیم،-ئێجگار زیادبوە). کشف الغمة ١٤٩/١-١٥٠

وه لـەبارەی وەسـفی(عـەلی)ەوە دەڵـێن:عـەلی،ڕەزای خـوای لەسـەر،ڕەنـگ خۆڵەمێشی بووە،بـاڵای مـام ناوەنـدبووە،زیـاتر لـە کورتیـەوە نزیـك بـووە،وەك لەدرێژی،ورگی زل بووە،پەنجە باریك بوە،باسکەکانی ئەستوربون،قاچـی باریـك بووە،شـڵەقاویەك لەچـاویا هـەبووە،ڕیـشی زۆریـووە،ناوچـەوان قۆقزبـووە).

مقاتل الطالبين ص٢٧

باشە ئەگەر شێوەو ڕەنگی پێشەوای باوەڕداران،ئاوەهـا بـوبێ کـە دەڵـێن،ئـەی دەبێ چۆن (فاطمة) پێی ڕازی بوبێ؟

لەبەر درێژەنەدان بەم دەقانـەی کـەهێنامان وازدێـنین،حـەزمان دەکـرد کـە لـە بـارەی هەریـەکێك لەپێـشەواکان سـەلامیان لەسـەر،چـەندین دەق ڕاگـوێز بکەین،بەلاّم دواتر وازمان لەمە هێناو،لەبارەی هەریـەکێکیان بـەپێنج گێڕانـەوە وازمـان هێنـا،پاشـان سـەرنجمان دا ئەمـە درێـژە دەکێـشێ کاتێـك لـەبارەی پێغەمبەرەوە،پێـنج گێڕانـەوەمان هێناولـەبارەی هەریـەك لەعـەلی وفاطمـة پێـنج گێڕانەوەمان هێنـا،ئەمەچـەندین لاپـەڕەی ویـست،لەبـەر ئەمـە لەمـەودوا هـەوڵ دەدەین زۆر بەکورتی باسەکان بهێنین،تا ئاگاداری زیاتری نهێنی یەکان بین.

*(الکلینی) لە کتێبی(الاصول من الکافی) نەقڵ دەکات کە:(جارێك (جوبرەئیل) دێت بۆلای محمد(صلی اللهعلیەوسلم)پێی دەڵێ:ئەی محمد،خوا مژدەت دەداتـێ بەمنـداڵێ کـە لـە فاطمـة دەبـێ وئـەو بـۆت دەخاتـەوە،لـەدوای تۆئوممەتەکـەت دەیکـوژن ،دەڵـێ:ئـەی جوبرەئیـل،سڵاو لەسـەر پـەروەردگارم بـێ،بـەلاّم مـن پێویستیم بەمنداڵێك نییە لە فاطمة،کە ئوممەتەکـەم لـەدوا خـۆم بیکـوژن،ئـیتر جوبرەئیـل دەچـێتەوە بۆئاسمـان و دواتـر دادەبەزێتـەوە سـەر زەوی وپێـی دەڵێ:ئەی محمد،پەروەردگارت سڵاوت لێدەکات و، مـژدەی ئـەوەت پێـدەدات، کـە لـە نـەوەی ئـەو منداڵـە پێـشەوایەتی وسـەرداری وجێنـشینایەتی دەخاتـە

نێویان،ئینجا محمد دەڵێ: باشە ئەوا ئیتر منیش ڕازی بوم،پاشان دواتر دەنێرێ بۆ لای فاطمة کەپێی بوترێ:خوا مژدەی داوە بە محمد بە منداڵێك کە لە تۆدەبێ،بەڵام ئوممەتەکەی لەدوای خۆی دەیکوژن(فاطمة)ش هەواڵ دەنێرێتەوە بۆ پێغەمبەر،کەمن هیچ پێویستیم بە منداڵێك نییە،کە ئوممەتەکەت لەپاش خۆت بیکوژن،ئەویش جارێکی تر دەنێرێتەوە بۆ لای فاطمة، کە خوا بەڵێنی داوە پێشەوایەتی و،سەرداری و،جێ نشینایەتی دەخاتە نێونەوەی ئەومنداڵەوە،ئیتر فاطمة ش هەواڵ دەنێرێتەوە کەمنیش ڕازیم،ئیتر پاشان بەپێناخۆش بونەوە سکی بو....،بەپێناخۆش بونەوە منداڵەکەی بو،(حسین) نە (فاطمة) وهیچ ئافرەتێکی تر شیریان پێنەدا،بەڵکو ئیتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەهات و،پەنجە گەورەی دەخستە دەمی (حسین)ەوە،ئیتر تا دوسێ ڕۆژ ئەمەی بەس بو).

من تێناگەم بۆدەبێ پێغەمبەر کارێك ڕەت بکاتەوە،کە خوا مژدەی پێداوە؟ ئایا (فاطمة الزهراء) سلاوی خوای لەسەر،کارێ ڕەت دەکاتەوە،کە خواویستی بێ وبیەوێ و،ئەویش بڵێ:پێویستیم پێی نییە؟ئایا کاتێ فاطمة سکی بە(حسین)وە دەبێ پێی ناخۆشە،کاتێ کە دەیبێ،پێی ناخۆشەو ڕقی لێیەتی؟ ئایا وای لێهاتووە بەجۆرێ کەخۆی شیر نەدا بە(حسین)و،پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێت وبە پەنجە گەورەی شیری بداتێ و،تادوسێ ڕۆژ بەشی بکاو،پێویستی بە شیر خواردنی ترنەبێت؟

بە ڕاستی حسینی گەورە و سەردارمان،زۆر لەوە گەورەترە لەم جۆرە قسانەی لەبارەوە بوترێ،زۆر لەوە گەورەتر و بەڕێزترە کە دایکی سك پڕبونەکەی پێیەوەی و،لەدایك بونەکەی،پێ ناخۆش بێ،هەمو ئافرەتانی دونیا ئاواتە

خوازن،یەکی دەکوڕی وەك (حسین)یان ببێ،دەی ئیترچۆن فاطمة دەبێ ئەمەی پێناخۆش بێ وشیری نەداتێ؟؟؟

لە کۆڕێکدا کە ژمارەیەك لەمامۆستایان و،قوتابی(حەوزەی عیلمی) ئامادەی بون،پێشەوا (خوئی) باسی لەچەند بابەتێکی جیاواز دەکرد،لە کۆتایی قسەکانیدا وتی:خوابێ باوەڕان بکوژێ،ئێمەش وتمان:کێن ئەوبێ باوەڕانە،وتی:نەواصیبەکان (واتەسوننەکان) کە جوێن بە(حسین)و ئەهلی بەیت دەدەن.

نازانم چی بەپێشەوا(خوئی) بڵێم؟

(ابوجعفر الکلینی) دەگێڕێتەوە،کاتێ کەپێشەوای باوەڕداران(ام کلثوم) ی کچی دەدات بە (عومەر)، (ابوعبداللە)،لەو کاری ژن مارەکردنەدا دەڵێ:ئەوە عەورەتێکە خستمانە ژێر داگیرکردنەوە).فروع الکافی١٤١/٢

ئێمە لەخاوەنی ئەم قسەیە دەپرسین:ئایا عومەر ئەم هاوسەرگیرییەی لەگەڵ (ام کلثوم) بە شێوەی شەرعی بو،یابە داگیرکردن داگیری کرد؟ ئەو قسەیەی کە دراوەتە پاڵ ئیمام صادق( ابوعبداللە) واتاکەی زۆر رونە،ئایا ابوعبداللە، ئەم قسە پڕوپوچانەی کردووە، لەبارەی کچی (عەلی)یەوە؟

پاشان گەر وا دابنێین کەعومەر (ام کلثوم)ی داگیرکردبێ، باشە چۆن باوکی کە بەشێری خواو، ذوالفقارو، لاوی قورەیش،ناسراوە بەمە ڕازی بو؟

*لەکتێبی (الروضةمن الکافی١٠١/٨،لە فەرمودەکەی (ئەبوبەصیر) لەگەڵ ئەو ژنەی کەهات بۆلای،(ابوعبداللە)،پرسیاری لێی کرد لە بارەی (ابوبکروعمر)ەوە،ئەویش بە ئافرەتەکەی وت:دۆستایەتیان بکەن ورقت لێیان نەبێت،ژنەکەش وتی:ئاخر ئەگەر گەیشتمەوە بەخوا،پێی بڵێم کە تۆ فەرمانت پێکردوم کەرقم لێ یان نەبێت؟وتی:بەڵێ.

دەی ئەو کەسەی کەفەرمانی کردووە دۆستایەتی بۆعمر دەربېڕێت، ئێستا تۆمەتباری بکەین کە ئافرەتێکی لەئەهل وبەیت داگیرکردووە؟

کاتێ لە بارەی وتەکەی (ابوعبدالله) لەبارەی دۆستایەتی (ابوبکروعمر) کە بە ژنەکەی وت،لە پێشەوا(خوئی)م پرسی ئەمەچۆن دەبێ،وتی: ئەمە بە فێلّ وای وتووە.

بە پێشەوا (خوئی) دەلّێم،باشە ئافرەتەکە لە لایەنگرانی ئەهلی بەیت بووەو،(ابوبصیر)یش یەکێك بووە لە هاوڕێیانی پێشەوا صادق (ابوعبدالله)، ئیتر پێویست دەکات بە فێلّ ئەم قسەیە بلّێ،ئەگەر ئەم گێڕانەوەیە ڕاست بێ،ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیە کە ئەو بەهانەیەی پێشەوا (خوئی) هێنایەوە ڕاست نییە.

وە لە بارەی (حسن)ەوە:

(المفید) لەکتێبی (الارشاد)دا لە خەلّکی کوفەوە دەگێڕێتەوە،کە: خەلّکی (کوفە) هێرشیان بردە سەر خێمەکەی(حسن)و چی تیا بوهەمویان دزی،تەنانەت بەرمالّەکەی ژێریشی،ناچار بەبێ بەرگ بە شمشێرەکەیەوە دانیشت. ص١٩٠

ئایا(حسن) ڕەزای خوای لەسەر، بەبێ بەرگ وبەڕوت وقوتی ولە بەرامبەر خەلّکەکە دانیشتووەوهیچ بەسەر عەورەت ولاشەیەوە نەبووە؟ ئا ئەمەیە خۆشەویستی.

کاتێ( حسن) لەمالّی خۆی دەبێ(سفیان کوڕی ابی لیلی)دەچێ بۆلای وبە پێشەواحسن دەلّێ:سلاّوت لێ بێ،ئەی سەرشۆڕکەری باوەڕداران ،(حسن) پێی دەلّێ:چۆن دەزانی من سەرشۆڕکەری باوەڕدارانم؟ دەلّێ: بەوە یادەزانم،کەتۆکاری ئەم ئوممەتەت گرتە دەست،بەلاّم دوایی وازت لێهێناو،خستە

ئەستۆی ئەومل هورە،کەبەبێ پەیامی خواحوکم دەکات).   رجال الكشى ص١٠٣

(حسن) سەرشۆڕکەری باوەڕدارانە؟یا بووە هۆی سەربەرزیان و،نەی هێشت خوێنیان بڕێژرێت وبەدانایی و بیرووردی خۆی،یەککڕیزی موسڵمانانی پاراست؟
خۆ ئەگەر (حسن) لەسەر خەلافەت و،دەسەلآت لەگەلّ معاویەدا بجەنگایە،ئەو کات دەریایەك لەخوێن هەڵدەسا،ژمارەیەکی وەها زۆر موسڵمان دەکوژرا کە مەگەر تەنهاخواخۆی بیزانیایە ژمارەیان چەندە دەبو،ئوممەتی ئیسلام پەرتەوازە دەبو،ئیتر ئەو کات کار لە کار دەترازا.
مەخابن ، کە ئەم جۆرە وتانە دەدرێتە پالّ (ابوعبدالله) سوێند بە خوا ئەو لەم جۆرە قسانەو،وتانەوە گەلێك دورە.
وە سەبارەت بەپێشەوا(صادق)،ئەواجۆرەها قسەو،جوێنی ناشرین لەلایەن ئەمانەوە ڕوبەڕوی بۆتەوە،هەرچی شتی ناشرین ونابەجێیە،خستویانەتە پالّی،لەگەڵمدا ئەم دەقە بخوێنەوە:
(زرارە) دەلێ:لەبارەی تەحیاتەوە، پرسیارم لە (ابوعبداللە) کرد،وتم: التحيات والصلوات...وپاشان لەبارەی شایەتومانەوە لێم پرسی، هەر وەك من هەمان شتی وتوە،وتی:التحيات والصلوات...،کاتێ کەچومە دەرێ لەلای، تڕێکم لێی دا بەڕیشیداو،وتم ئەم کابرایە قەت سەرناکەوێ)   رجال الكشى ص١٤٢
*بەڕاستی حەقمانە بگرین لەسەرخوێنی پێشەوا صادق،ڕەزای خوای لەسەر،بەلێ....وتەیەکی ئاوا قێزەون لەبارەی ابوعبداللەوە دەوترێ؟؟دەگونجێ ئاخر،
(زرارە) (تڕ) بە ڕیشی (ابوعبداللە) ڕەزای خوای لەسەر،بکا؟بەکەسێکی وەك پێشەوا(صادق) بلێ:قەت سەرکەوتونابێ؟

ئەوکتێبـەی (الكشی) دە سـەدە،بەسـەر نوسـینی تێپـەڕیوە،لـەنێو زانایـانی شیعەدا،بـەجیاوازی گـروپ ودەسـتەکانیان،دەسـتاو دەسـتی کـردووە کەسـیانم نەبینی کەبێت و،ڕەخنە لەو قسەیە بگرێ،یاهیچ نـەبێ ئاگاداریـەکی لەسـەربدات هەتاخودی پێشەوا(خوئی) کـاتێ دەسـتی کـرد بەنوسـینی کتێبـە گەورەکـەی بـەناوی(معجم رجـال الحـديث)،مـن یـەکێك بـوم لـەو کەسـانەی کەیارمـەتیان دا،لەسـەر نوسـینی ئـەم کتێبـەو،کۆکردنـەوەی گێڕانـەوەکان لـەنێو کتێبەکانـدا،بـەڵام کـاتێ ئەوڕیوایەتـەمان لەبـەرگوێی ئـەودا خوێنـدەوە،کـەمێك سـەری داخـست و،پاشـان وتـی:هـەمو ئەسـپێ سەرسـم دانێکـی هەیەو،هەموزانایەکیش هەڵەدەکا،ئیتر لەمە زیاتری نەوت،بـەڵام ئاخرئـەی زانـای بەڕێز،هەڵەی زانا بەهۆی بێئاگاییـەوە،یـا بـە هـۆی هەڵەیـەکی بـێ مەبەسـتەوە ڕودەدات،بـەهێزیی نێـوان مـن وتـۆ،وەك بـاوك وکـوڕ وایـە،تۆبـۆمن لـەجێی باوکمی،پێویستە لەسەرم ئەم قسەیەت وەك نیاز پاکییەك لێك بدەمـەوە،دەنـا قـەت لـێم قبـوڵ نـەدەکردی و،بێـدەنگ نـەدەبوم لێـت،کـەئاوەها سـوکایەتی بەپێشەوا(صادق) بکەی ڕەزای خوای لەسەر.

ثقة الاسلام الكلينی،دەڵێ:(هشام کوڕی حەکەم و،حەمماد ، بۆیان باسکردم ،کە "زرارە" وتویـەتی: لـەدڵی خـۆم داوتم: پـیرە پیاوێکـە، هـیچ زانـستێکی بەموناقەشەو دەمەدەمێ، نییە ، مەبەست پێشەواکەی بو).

لەڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا ئەمەیان نوسیوە:ئەو پیرەپیاوە ، پیرێکە هیچ عەقڵی نییە،لەگەڵ بەرامبەریشدا باش نازانێ قسەبکات.

جا ئایا پێشەوا صادق عەقڵی نیە؟بە ڕاستی دڵم لەداخ وخەفەتا دەگوشرێ،ئـەم ئـەموجوێن وسـوکایەتی و،چاونەترسـییە،ئـاخر شـیاوی ئـەهلی بـەیت نییە،پێویستەکات ئەدەبمان لەگەڵیاندا هەبێ.

وه دەربارەی (عەباس) و،هەرسێ کوڕەکەی (عبداللەو،عبیداللەو،عقیل) سلاّویان لەسەر،ئەمانیش لەتانەو تەشەروخراپەیان بەدەرنەبون،لەگەڵ مندا ئەم دەقە بخوێنەوە:لەبارەی ئایەتی:( لَبِئْسَ الْمَوْلَى وَلَبِئْسَ الْعَشِيرُ)الحج/١٣ الكشی ،دەگێڕێتەوە کەئەم ئایەتە دەربارەی (عباس) دابەزیوە.     رجال الكشی ص٥٤

هەروەها:هەردو ئایەتی:( وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الْآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلًا)الاسراء/٧٢ وه ئایەتی ( وَلَا يَنْفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدْتُ أَنْ أَنْصَحَ لَكُمْ إِنْ كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ)هود/٣٤،دەربارەی (عباس)هاتۆتەخوارەوە.     رجال الكشی ص٥٢-٥٣

هەروەها (الكشی) دەگێڕێتەوە،کە پێشەوای باوەڕداران ( علی) دوعای لە (عبداللەکوڕی عباس)و(عبیداللە)ی برای کردووەو،وتویەتی:.(خوایە نەفرین لەهەردو منداڵەکەی فلاّنەکەس بکە،واتە: عبداللەو عبیداللە چاوەکانیان کوێربکە،هەروەك چۆن دڵی هەردوکیانت کوێرکردووە لەبارەی مافی من بەسەریانەوە،خوایە کوێری چاوەکانیان بکەرە بەڵگەو نیشانە لەسەر کوێری دڵیان).     رجال الكشی ص٥٢

(ثقةالاسلام ابوجعفر الكلینی)، لەکتێبی (الفروع)دا، دەگێڕێتەوە ، کە پێشەوا (باقر)لەبارەی پێشەوای باوەڕداران (علی)دەڵێ:(دوکەسی لاوازو،سەرشۆڕ، کەتازە هاتبونە نێو ئیسلامەوە ، لەگەڵ (علی)دا مانەوە،ئەوانیش (عباس) و (عقیل) بون).

ئەوسێ ئایەتەی (الكشی) پێی وایە لەبارەی (عباس )ەوە دابەزیون،واتاکەی ئەوە دەگەیەنێ کە:عباس کافرەودەبێ هەتاهەتایی لەنێو دۆزەخدابێت،دەی ئەگەر وانییە،ئەی واتای (فهوفی الاخرة اعمی واضل سبیلا)چی دەگەیەنێ؟

وه دوعــاکردنی عــەلیش لەهــەردو کوڕەکــەی عبــاس ،بەنــەفرین و،چاوو،دڵ،کوێربون،ئەمەش بێ باوەڕی ئەودو کوڕەی دەگەیەنێ.

(عبدالله کوڕی عباس)کە سوننەکان پێی دەڵێن:ڕاڤەکاری قورئان و،زانای ئوممەتی ئیسلام،سەیر کە ئێمەچۆن نەفرینی لێدەکەین و،بانگەشەی ئەوەش دەکەین،کە ئێمە ئەهلی بەیتمان خۆش دەوێت؟سلاّویان لەسەر.

دەربارەی (عقیل) ڕەزای خوای لەسەر،برای پێشەوای باوەڕداران (علی) بووە ، ئایاعقیل سەرشۆڕبووە؟ تازە موسڵمانە؟

دەربارەی پێشەوا(زین العابدین) عەلی کوڕی حسین،(الکلینی) دەگێڕێتەوە کە (یەزیدکوڕی معاویە،داوای لێدەکات ببێتە کۆیلەی ئەویش –ڕەزای خوای لەسەر بەمە ڕازی دەبێت و،دەبێتە کۆیلەی (یەزید)و دەڵێ:ئەوا من ڕازی بوم بەوەی کە داوات کرد،من کۆیلەیەکی زۆر لێکراوم،ئەگەر ویستت بیهێڵەوە ، ئەگەر ویستیشت بیفرۆشە). الروضة من الکافی ٨/٢٣٥

بڕوانە قسەکەی و واتاکەشی:من ڕازی بوم کە ببمە کۆیلەی تۆ،وەمن کۆیلەیەکی زۆرلێکراوم،گەر ئارەزوت کرد،وەك کۆیلەیەکی خۆت بم هێڵەوە،وەگەر ویستیشت بم فرۆشی،بم فرۆشە)ئایا پێشەوا (ڕەزای خوای لەسەر) دەبێتە کۆیلەی یەزید،تا هەرکات ویستی بیفرۆشێ وهەرکاتیش ویستی بی هێڵێتەوە؟

ئەگەر بمانەوێ کەچی دەربارەی ئەهلی بەیت وتراوە،هەموی بهێنین،ئەوا باسەکە زۆر درێژە دەکێشێ،بەڕاستی هیچ یەکێك لەئەهلی بەیت،دور نەبوە،لەوەی قسەی ناشرین وقێزەونی پێنەوترابێ،یاکارێکی نەشیاوی نەخرابێتە پاڵ،هەمو ئەمانەش لە کتێبە متمانە پێکراوەکانی ئێمەدا هاتووە لەبەشی داهاتودا بەشێك لەم باسەباس دەکەین.

لەگەڵ مندا ئەم گێڕانەوەیە بخوێنەوە:

(ابوعبدالله) ڕەزای خوای لەسەر ،دەڵێ:پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستوری وابو،کەشەوانە نەدەنوست،هەتا پانتایی دەم وچاوی فاطمة ی ماچ نەکردایە). بحارالانوار ٤٣-٤٤

(وە پێغەمبەردەم وچاوی دەخستە نێوان هەردومەمکی فاطمة) وە. بحارالانوار ٤٣-٧٨

باشە ئاخر فاطمة ئافرەتێکی ڕەسیدە بووە،ئایاعەقڵ دەیگرێ پێغەمبەر دەم وچاوی خستبێتە نێوان هەردو مەمکی یەوە؟جائەمە ئەگەر پشك وچانسی ،پێغەمبەر وفاطمة بوبێ،ئەی دەبێ ئەوانی ترچۆن بوبێ؟هەتا گومانیان لەپێشەوا (محمدالقانع) پەیدا کردووە،کەئایا کوڕی پێشەوا (رضا)یە ،یاخود کوڕی(...).

بۆڕاستی ئەم قسەیە،وەرە لەگەڵ مندا ئەم دەقە بخوێنەرەوە:عەلی کوڕی جعفر الباقر دەڵێ: بە (رضا) ڕەزای خوای لەسەر،وترا: لەنێو ئێمەدا هیچ پێشەوایەك نەبووە کەڕەنگی ڕەش بێ، (رضا)ش پێیان دەڵێ:ئەوە کوڕی منە،وتیان: پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ئیشی بەناسینەوەی لێك چونی کەسەکان کردووە،کەوایە با کەسێکی شارەزا بێت،تابزانێ تۆوئەم کوڕە لەیەك دەچن، (رضا)دەڵێ:ئێوە خۆتان بنێرن تائەو کەسە بێت،بەلأم من شتی واناکەم و،پێشیان مەڵێن:بۆبانگتان کردون و،بالەماڵەکانی ئێوەش بێ،(علی کوڕی جعفر)دەڵێ:کاتێ کەکەسە شارەزاکانیان هێنا لە ناسینەوەی خەڵك دا،لەنێو باخەکەدا،دایان نان،مامەکان و،خوشك وبراکانی ڕیزبون (رضا) یان هێناوجبەیەکی خوریان کردە بەری و،کلأوێکیان نایەسەری و،(بێل)ێکیشیان نایە سە رشانی و،پێیان وت:بەجۆرێ وەرە ژورەوە بۆنا وباخەکە،وەك ئەوەی کەتۆ گوایە لێرەدا کار دەکەی، پاشان (جعفر)ی باوکیان هێناو،بە کەسەکانیان

وت:ئەم منداڵە بزانن کامەباوکیەتی؟ئەوانیش وتیان:ئەم منداڵە باوکی لێرەدا نییە ،بەلاَم ئەوە مامی باوکیەتی ،چونکە قاچیان وەك یەك وایە، کاتێکیش کە (ابوالحسن) گەڕایەوە،وتیان:ئا ئەمە باوکییەتی)اصول الکافی ۱/۳۲۲

*واتە ئەوانە گومانیان هەبوە،لەوەی کە (محمد القانع) سلاَوی لەسەر،کوڕی (رضا) بێت ،کە لەهەمان کاتیشدا (رضا) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ئەوە کوڕی ئەوە،بەلاَم تەواوی خەڵکەکە نکوڵی لەمە دەکەن،هەر بۆیە دەڵێن هیچ کات لەنێو ئێمەدا پێشەوایەکمان تیا نییە ڕەنگی ڕەش بێ، گومان لەمەدا نییە کە ئەم جۆرە قسەیە،تانە دانە لە ناموسی (رضا ) و تۆمەت بارکردنی هاوسەرەکەی،کەگومان نییە هاوسەرەکەشی ئافرەتێکی داوێن پاك بووە،هەر بۆیە دەچن کەسێکی شارەزا بە ناسینەوەی خەڵکی بێنن بەلاَم دواجار کە شارەزا کە بڕیار دەدات کە(محمدالقانع) کوڕی پشتی(رضا)یە،ئێترلەوەدا بێدەنگ دەبن.

دەکرێ کەسانێك بەم جۆرە تاوانانە تاوانباربکرێ وهەندێ جاریش خەڵکی باوەڕبکەن،بەلاَم تاوانبارکردنی ئەهلی بەیت،سلاَویان لەسەر–بەڕاستی ئەمە زۆر کارێکی ناشرینە،بەلاَم مەخابن،ئەوسەرچاوانەی ئێمە،کە ئێمە پێمان وایەزانستی ئەهلی بەیتیان ڕاگوێزکردووە،پڕە لەشتی ئاوەها پڕوپوچ،لاحول ولاقوة الابالله،کاتی خۆی کەلە(حەوزەی عیلمی)ئەم دەقەمان خوێند،زۆربەئاسایی وبەڕێزەوە،زاناکانمان بەسەریاندا ڕایانبوارد،ئێستاش بەهانەو پاساوەکەی(خوئی)م لەیادە کاتێ کەئەودەقەم نیشاندا،ئەویش لەزمانی(سید ال کاشف الغطاء)ەوە وتی: بۆیە ئەوخەڵکە ئاوەهایان لەبەرامبەر (رضا)کردبو،چونکە ئەوان سوربون لەسەرئەوەی کەدەبێ،ئەوەی ئەوان بەپاکی بمێنێتەوە!!

نــەك هەرئــەوە بــەڵكو (رضــا) تاوانبــار دەكــەن كەگوايــە عاشــقى ئامۆزاكــەى (مەئمون)بووەو،ئەو كچەش بەهەمان شێوە عاشقى(رضا)بــووە. بڕوانــە/عيــون اخبارالرضا ص١٥٣

وەبــە (جعفــر)يــان دەوت:(جعفــر الكــذاب) و،جــوێن و،قــسەى ناشــرينيان پــێ دەوت،لەگــــەڵ ئـــــەوەى كـــــەجعفر بـــــراى(الحـــــسن العـــــسكرى)ە،الكلينـــــى دەڵێ:(جعفرمەلعونە،فاسق وفاجرو،كەم دين وخراپــەكار)ە،ئــارەق خــۆرە،ســوك وڕسوابووە،پياوى وا كەمم نەديوە). اصول الكافى ٥٠٤/١

لەنێو ئەهلى بەيتا،سلاّويان لەسەر،ئارەق خۆرو،فاسق وفاجر،ئەبێ هەبێ؟

ئەگەر بمانەوێ باسى زياتر بزانين،دەبێ سەرچاوە متمانە پێكراوەكــانى خۆمــان بخوێنينەوە،ئەوكات دەزانــين،كەچــى لــەبارەى ئــەوانى تــرەوە وتــراوە،ســلاّويان لەسەر،دەبــێ بــزانين كەچــۆن نــەوە پاكــەكانيان كــوژراون و،لــە كــوێش و،كــێش ئەوانيان كوشت؟

بەڕاستى ژمارەيەكى ئێجگار زۆر،لەئەهلى بەيت،لەســەر دەســتى ئەمانــە،لــەنزيك وڵاّتى فارس كــوژران،ئەگــەر لەبــەر درێــژ بونــەوەى باســەكە نەبوايــە،ئــەوا نــاوى ئەوانــەو،ئەوانەشــى كــە كوشــتويانە،دەمنوســى،بــەلاّم خوێنــەرى بــەڕێز ئاگــادار دەكەم،كە بچن كتێبى(مقاتل الطالبين) ى ئەصفەهانى ،بخوێننەوە،كەئەم باســە بە جوانى ڕون دەكاتەوە.

وە بزانــە: زۆربــەى هــەرە زۆرى كەڕوبــەڕوى تانــەو،قــسەى ناشــرين بونەتــەوە، پێشەوايان (محمدالباقر) و (جعفرالصادق)ى كوڕييەتى سلاّوى خوايــان لەســەر، كە زۆربەى بابەتەكانيان دراوە تەپاڵ،وەك (توقيــە) و(موتعــە)و(لــەدواوە چــونى ئافرەتان ولەشفرۆشى و.....تاد.

که بەدڵنیاییەوە،ئەم دوبەڕێزە، لەمانە بێ بەرین و،زۆر دورە پـەرێزن، لـە شـتی ئاوهاوە.

## موتعە و ئەوەشی پەیوەندی بەم باسەوە هەیە:

سەرەتامن دەم ویست،ناونیشانی ئەم باسە بەم نـاوەوە بنوسـم(ئـافرەت لـەلای شیعە)،بەلآم پاشان لەمە خۆم بوارد،چونکە کاتێ بینیم هەمو ئـەو ڕیوایەتانـەی کە کتێبەکانی ئیمە،ڕیوایـەتیان کـردووە، گێڕانـەوەکان دەدەنـە پـاڵ پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم)و،پێشەوای باوەڕداران (علـی) و، (ابوعبداللـه) و،کەسـانی تر لە پێشەوایان.

نەم ویست هیچ تانەیەك بدرێت لە پێشەوایان،سـلآویان لەسـەر ،چـونکە قـسەی زۆر نابەجێ وناشرینیان لەو گێڕانەوانەدا هەیە،کەهیچ یەکێ لەئێمـە پێـی خـۆش نییـە بدرێتـە پـاڵ خـۆی،چ جـای پێـی خـۆش بێـت بدرێتـە پـاڵ پێغەمبـەرو پێشەوایان.

بەڕاستی (موتعە)بەشـێوازێکی زۆرخـراپ بـەکارهێنراوەو،ئـافرەت بـەقێزەونترین جۆربێ ڕێزیی بەرامبەرکراوە،زۆرێك بەناوی دین و،لەژێرپەردەی موتعـەدا،شـوێن تێرکردنـی ئـارەزووە،سێکـسیەکانیان کـەوتون ، بـەناوی،گوایـەخوای گـەورە لەقورئانـدا باسـی کـردووە کـە دەفـەرموێ:( فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً).النساء/٢٤

شیعەکان زۆر گێڕانەوەیان هێناوە،کە هاندانی تێدایە لەسەر موتعەکردن،وە گەر کەسـێ ئـەنجامی بـدات،پاداشـتی هەیـەو،ئەوەشـی نـەیکات،سـزای قیامـەتی هەیە،نەك هەر ئەوەندە،بەڵکو دەڵێن:ئەوەی موتعە نەکات،موسڵمان نییە.

وەرە لەگەڵ مندا ئەم دەقانە بخوێنەوە:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەڵێ:هەر کەسێ،لەگەڵ یەك ئافرەتی باوەڕدارا،موتعە بکات،وەك ئەوەوایە،کەحەفتاجار سەردانی(کەعبە)ی کردبێ)، (من تمتع بإمرأة مؤمنة،كأنما زار الكعبة،سبعين مرة).

بڕوانە:ئایا کەسێ موتعە بکات،وەك ئەو کەسە وایە،حەفتاجار سەردانی کەعبە بکا؟لەگەڵ کێشدا؟لەگەڵ ئافرەتێکی باوەڕدار؟

(الصدوق)،له (صادق) دەگێڕێتەوە،کە وتویەتی:موتعە،دین و ڕێبازی من وباوك وباپیرانی منە،هەر کەسێ ئەنجامی بدا،کاری بەدینی ئێمە کردووە،هەر کەسێکیش نکوڵی لێ بکات،ئەوا نکوڵی لەدینی ئێمە کردووە و،باوەڕی بەغەیری دینی ئێمەهێناوە). من لايحضره الفقيه /٣-ص٣٦٦

ئەمە بە ئاشکرا،کافر کردنی ئەوکەسەی تێدایە،کەموتعە قبوڵ ناکا.

بە ابوعبدالله، وترا ئایا موتعە کردن پاداشتی هەیە؟ وتی: گەر بەو کارە،مەبەستی خوابێ،ئەوا ئەو پیاوە هەر قسەیەك،کە لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا،دەکات لەوکاتەدا ،خوا چاکەیەکی بۆ دەنوسێ،وەگەر لێی نزیك بۆوە،خوالێی خۆش دەبێ ،وەئەگەر خۆی شۆری،ئەوا خوا بە ئەندازەی ئەو ئاوانەی،بەسەرموی ئەو پیاوەدا ، دەڕوا،بە ئەندازەی ئەوە لێی خۆش دەبێ).

من لايحضره الفقيه ج٣/ص٣٦٦

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دەڵێ: کەسێ یەك جارموتعە بکا،لە تووڕەیی خوا،بەدور دەبێ،کەسێ دوجار بیکا،لەگەڵ چاکەکاران کۆدەکرێتەوە،کەسێ سێ جاربیکا،ئەوا لە بەهەشتا پاڵەپەستۆ و ،شەڕە پاڵ لەگەڵ مندا، دەکات).

من لايحضره الفقيه ج٣/ ٣٦٦

جا بۆ دەست خستنی ئەم پاداشتە،هەمو زاناکانی (حەوزەی نەجەف) و،تەواوی حوسەینیەکان و،جێگەی پێشەواکان،زۆر ئەم کارە دەکەن،بە تایبەتی لەنێو

ئەمانـەدا: سـید (صـدر ، بروجـردی ، شـیرازی ، قـەزوێنی طباطبـائی ،سـەید مـەدەنی)،هـەروەها کـوڕەلاوی پێگەیـشتو (ابوحـارث الیاسـری) وکەسـانی تریش،ئەم کەسانە زۆر،زۆرو،ڕۆژانـە،خـەریکی موتعـە کـردنن،بـەهیوای ئـەوەی ئەوخێرەیان دەست کەوێت و،شەرەپاڵ لەگەڵ پێغەمبەردابکەن.

سەید (فتح اللەالکاشانی) لـە کتێبـی(تفسیرمنهج الـصادقین) لـە پێغەمبـەرەوە (صلی الله علیـه وسلم) دەگێڕێتـەوە،کـە وتویـەتی:هەرکەسێك یـەك جارموتعـە بکـات،ئـەوا پلـەی وەك پلـەی(حـسین)وایـە،ئـەوەی دوجـار بیکـات،پلـەی وەك پلـەی(حـسن )وایـە،ئـەوەی سـێ جاربیکـا،پلـەی وەك پلـەی (علـی بـن ابـی طالب)وایە،ئەوەی چوار جار بیکا،پلەی وەك پلەی من وایە).

گەر وادابنێین:ئەگەر کەسێکی خراپەکار،یەکجارموتعە بکات،ئایاپلەی وەك پلەی حسین وایە؟ وە ئەگەر دوجار،یاسێ ،یاچوار،جارموتعە بکات،پلـەی وەك پلـەی حـسن وعـەلی وپێغەمبـەرە؟ سـلاویان لەسـەر. ئایـا پلـەی پێغەمبـەرو پلـەی ئەوپێشەوا بەرزانە،تا ئەو ئەندازەیە بێ نرخە؟

باشـە هـەتا گـەر ئەوکەسـەی موتعـە دەکات،لەئیمانـدا پلـەی بگاتـە پلەیـەکی بەرز،ئایا دەگاتە پلەی حسین یابراکەی؟یاباوکی،یاباپیری؟

بەڕاستی جێگەو پلەی حسین زۆر لەوە بـەرزترە،کەکەسـێ پێـی بگـات،گەرچـی ئیمانیشی زۆر بەهێزبێ،پلەی حسن وعەلی وپێغەمبەر سلاو لەهـەمویان بـێ هـیچ کەسێ پێی ناگات،هەرچەندە باوەڕیشی بەرزبێ

نەك ئەوەندە ،هەتا موتعە کردنیان،لەگەڵ ئەو ئافرەتانەشدا بە ڕەوا بینیوە ،کە (هاشمین) وەك (الطوسی) لە (التهذیب)ج٢ /١٩٣، دەیگێڕێتەوە.

منيش دەڵێم: بەڕاستی ئافرەتە هاشمييەكان،زۆر لەوە بەرزترن كە موتعەيان لەگەڵ بكرێ،ئەوانە زنجيرەی پێغەمبەرايەتين و،لەئەهلی بەيتن،ئەمانە دورن لەم كارەوە،وەك لەدوايی دا هۆكارەكەی باس دەكەين.

(الكلينی) ئەوە ڕون دەكاتەوە كە موتعە بەيەك جاريش ڕودەدات،لەنێوان پياو،ئافرەتەكەدا،ئەمەش بەدەق لەكتێبی(فروع الكافی)ج٥ /٤٦٠،داهەيە.

وە بەمەرج نەگيراوە،كە موتعە كردن دەبێ ئافرەتەكە ڕەسيدە (بالغ) بوبێ،بەڵكو موتعە،دەتوانرێ لەگەڵ ئافرەتێكيشدا بكرێ،كە لە خوار تەمەنی دە ساڵی يەوە بێت.

(الكلينی) لە(فروع الكافی):٥ /٤٦٣، (الطوسی)لە(التهذيب)ج٧ /٢٥٥ ،دەگێڕنەوە كە،بە (ابوعبدالله)وترا: كچی بچوك ئايا پياو دەتوانێ موتعەی لەگەڵدا بكا؟ئەويش دەڵێ:بەڵێ،تەنها مەگەر كچێكی وابێ كە هەڵبخەڵەتێ،وترا: جائەو تەمەنە چەندە،گەر پێی گەيشت،هەڵ نەخەڵەتێ؟ وتی:تەمەنی دەساڵی يە.

ئەم دەقانە (ان شاء الله)هەموی لەدوايدا،وەڵامەكانيان دێ،بەلأم دەڵێم: ئەو شتانەی دراونەتە پاڵ (ابوعبدالله)ڕەزای خوای لەسەر،كە دروستە موتعە لە گەڵ ئافرەتێكدا بكرێت كە دە ساڵ بێت،دەڵێم:هەندێ لە زاناشيعەكان پێيان وايە كە دروستە موتعە لەگەڵ ئافرەتێكدا بكرێ كە لە خوار ئەم تەمەنەشەوە بێت.

ئەوكاتەی پێشەوا (خومەينی) لەعێراق دەژيا،ئێمە بۆ وەرگرتنی زانست زورو دەچوين بۆلای،تاوای لێهات پەيوەندی نێوانمان زۆربەتين بو،هەتاجارێك وا ڕێكەوت،بانگ هێشتێكی بۆهات،لەيەكێ لەشوێنەكانی عێراق، كەدەكەوتە ڕۆژئاوای شاری (موصل) كە بە ئوتومبيل،كات ژمێرونيوێك دوربو لە

موصلەوە.(خومەینی) داوای لێکردم ،لەم سەفەرەیدا،هاوڕێیەتی بکەم،منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم،خەڵکی ئەوجێگەیە بەڕاستی پێشوازی وڕێزێکی چاکیان لێکردین ولێگرتین،لەماوەی ئەومانەوەیەماندا، لەلای خێزانێکی شیعە،کەلەوجێگەیەدەژیان ماینەوە وەپەیمانیاندا،کەبیری شیعە لەو ناوچەیەدابڵاوبکەنەوە،کەتا ئێستا ئەوێنەیادگاریەیان پاراستووە ولەلایانە،کەلەماڵەکەی خۆیاندا،وێنەی ئێمەیان گرت.

چاکاتێ ماوەی سەفەرەکە کۆتایی هات،گەڕاینەوە،لەڕێگەی گەڕانەوەمان وتێپەڕینمان بەشاری(بەغداد)ئیمام خومەینی ویستی کەمێك پشوبدات،لەئەنجامی ماندوبونی سەفەرەکەی،فەرمانی دا بەرەو ناوچەی (العطیفیة) برۆین،کەلەوێ پیاوێکی لێ بو،بە ئەصل ئێرانی بو،پێیان دەوت:سەید صاحب،پەیوەندی وناسیاوییەکی بەهێز،لەنێوان ئەوو،ئیمامدا هەبو.

(سەیدصاحب) زۆر دڵخۆش بو بەچونەکەمان،کاتێ گەیشتینە ئەوێ لای نیوەڕۆ بو،خواردنێکی باش وچاکی بۆ ئامادەکردین،وەپەیوەندی کرد بە هەندێ لەخزمەکانیەوە،ئەوانیش ئامادەبون،ماڵەکەی لەخۆشی ئێمە جمەی دەهات،(سەیدصاحب) داوای لێکردین کە ئەو شەوە لەلای ئەو بمێنینەوە،ئیتر ئیمامیش ڕازی بو،کاتی خواردنی ئێوارە،شێویان بۆ هێناین،ئیتر ئامادەبوان دەستی ئیمامیان ماچ دەکردو،تا درەنگانێك ئەوان پرسیاریان دەکردو،ئەویش وەڵامی دەدایەوە،ئیتر کەکاتی خەو هات،ئامادەبوان هەمو ڕۆیشتن،جگە لەخێزانی ماڵەکە،ئیمام (خومەینی) چاوی کەوت بەکچێکی منداڵ کار کە تەمەنی چوار یا پێنج ساڵان دەبو،بەڵام زۆرجوان بو،ئیمام داوای لەسەید صاحبی باوکی کرد،کە ئەو کچە بچوکەی بۆئامادە بکات،تا لەگەڵیدا ڕابوێرێ، باوکیشی بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە،ڕازی بو،ئەوشەوە ئیمام خومەینی تابەیانی

لەگەڵ ئەوکچەدا لەباوەشیدا،لەگەڵیدا ڕایدەبوارد،ئێمە گوێمان لەگریان وهاواری کچەبچوکەکەبو کە دەگریاوهاواری دەکرد،لەتاوئازارو.......

بەهەرحاڵ ئیمام ئەوشەوەی بەڕێکرد،جاکاتێ ڕۆژ بۆوەو،دانیشتین بۆنانی بەیانی،سەیری منی دەکرد،بینی کە نیشانەی ناڕەزایی بە ئاشکرا بەدەم وچاومەوە دیارە،کەلەگەڵ ئەو کچە منداڵەدا موتعەو ڕابواردنی کرد بو،بەمەرجێ لەوماڵەداچەندین کچی گەورە و گەنج وڕەسیدەش هەبون،کە دەیتوانی لەگەڵ هەرکامیانــدا ڕابــوێرێ،بــەڵام نــەیکرد؟ پێــی وتم:سەیدحــسین لــەبارەی موتعەو،ڕابواردن لەگەڵ کچی منداڵدا،چی دەڵێی؟ منیش پێم وت:قوربان قسە قسەی جەنابتەو ڕاست و دروست کاری جەنابتە،جەنابت پێشەواو،موجتەهیدی و،نـاگونجێ بۆکەسێکی وەك مـن شـتێ بڵـێم یـان ببیـنم،تـەنها ئـەوە نـەبێت کەجــەنابت دەیبینــی و،دەیڵێــی،(دیــارە ئــەوکات مــن نەمــدەتوانی دژی بوەستمەوە).

وتی: سەید حسین،ڕابواردن لەگەڵ کچی منداڵدا دروستە،بەڵام بە دەست بازی و،ماچ کردن و(ذکر) خستنە نێو ڕانەکانی،بەڵام جوت بون لەگەڵیدا،ئەوا تەحەممول ناکات وتوانای نییە(واتە ئەمەیان نابێت).

ئیمام (خومەینی) بەلایەوە دروست بو،کە ڕابواردن تەنانەت لەگەڵ کچی شیرە خۆرەشدا بکرێ،دەڵێ:هیچ خراپەیەکی تێدانییە،ئەگەر لەگەڵ منداڵی کچی شیرەخۆرەدا موتعەو ڕابواردن بکرێ ، بەباوەش پیاکردن وکردن بەنێو ڕانیدا و،ماچ کردنی )دا. بروانە/تحريرالوسيلة :٢ /٢٤١،مسالةرقم ١٢–خومەینی.

ڕۆژێك لەلای ئیمام (خوئی) دانیشتبوم لەکتێبخانەکەی،دوکوڕی لاو هاتنە ژورەوە وادەردەکەوت لەباسێکدا جیاوازیان لەنێواندا، ڕویدابێ و،دواتر ڕێکەوتبون کەبێن وپرسیار لە ئیمام (خوئی) بکەن تا وەڵامیان

بداتەوە.یەكێكیان پرسی:ئەی سەید لەبارەی موتعەوە دەڵێن چی،ئایاحەلاڵە یان حەرام؟ئیمام (خوئی) سەیرێكی كرد،وەك ئەوەی لەپرسیارەكەیدا شتێكی هەست كردبێ،پاشان پێی وت: لەكوێ دەژی؟ گەنجەكە وتی:لەشاری موصل،بەلاّم ئەمە ماوەی نزیكەی دومانگ دەبێ هاتومەتە شاری نەجەف ولێرە نیشتەجێم.ئیمام پێی وت: كەواتە ،تۆ سوننی مەزهەبی؟ گەنجەكە وتی:بەڵێ.
ئیمام پێی وت:موتعە لەلای ئێمە حەلاڵە،بەلاّم لای ئێوە حەرامە.
گەنجەكە وتی:ئەوا من نزیكەی دومانگە لێرەم،لەجێگە وشاری خۆم دور كەوتومەتەوە ، بۆكچەكەی خۆتم لێ مارە نابڕی،تاموتعەی لەگەڵدا بكەم،تا ئەوكاتەی دەچمەوە ناوكەس وكاری خۆم؟ئیمام ماوەیەك چاوێكی زەقی لەگەنجە بڕی و،پاشان پێی وت:من سەیدم،ئەم كارە بۆ سەید حەرامە، كەكچی بدابە خەڵك تاموتعەی لەگەڵدا بكرێ،بەلاّم بۆ ڕەشە خەڵكی شیعە حەلاڵە.
گەنجەكە بە زەردەخەنەیەكەوە،سەیرێكی ئیمام (خوئی) كرد،ڕوانینی گەنجەكە ئەوەی تیا ئەخوێندرایەوە،كەوەك ئەوەی بزانێ،كەئیمام (خوئی) كاربە (توقیە)چاوبەست دەكات.
پاشان دولاوەكە هەستان وڕۆیشتن،پاشان منیش مۆڵەتی چونە دەرەوەم لە ئیمام (خوئی) وەرگرت و،گەیشتمەوە بەدولاوەكە،زانیم ئەوەی كەپرسیارەكانی كرد سوننەیەو،ئەوی تریشیان شیعەو،لەبارەی حەلاڵی وحەرامی،موتعەوە ناكۆكیان تێكەوتووە،دواتر ڕێكەوتون كەبێن پرسیار لە مەرجەعی دینی ئیمام (خوئی) بكەن،جاكاتێ كەوتمە قسەكردن لەگەڵیاندا،گەنجە شیعەكە بەدەم وچاوما تەقییەوەو،وتی:ئێوە بۆخۆتان موتعە بەڕەوا دەبینن،تا لەگەڵ كچەكانماندا بیكەن و،پێمان دەڵێن: حەلاڵەو ،بەم كارە لە خوانزیك

دەبنەوەو،کەچی لەسەرئێمەی حەرام دەکەن،کەموتعە لەگەڵ کچەکانتان بکەین؟

ئیتر دەستی کردبەجوێن دان وقسەی ناشرین و،سوێندی خوارد کە ئیتر لەمەودوا دەچێتە سەر مەزهەبی سوننی،منیش هەوڵم داتا ئارامی بکەمەوە،پاشان سوێندم بۆخوارد کە موتعە حەرامەو،لەسەر ئەمەش بەڵگەکانم بۆڕون کردەوە.

بەڕاستی موتعە لەسەردەمی نەفامیداحەلاڵ بو، کاتێکیش ئیسلام هات، تاماوەیەك ئەم کارەی هێشتەوە،پاشان لەڕۆژی غەزای خەیبەردا،حەرامی کرد،بەلأم ئەوەی لەلای شیعە زانراوەو،لەلای جەماوەری زاناکانمان ئەوەیە،کە (عمربن الخطاب)،موتعەی حەرام کردووە، ئەمە هەندێ لەزاناکانمان وای دەگێڕنەوە.

بەلأم ئەوەی پەسەندبێت لەم بارەوە ئەوەیە کەموتعە لەڕۆژی خەیبەردا حەرام کرا.

پێشەوای باوەڕداران سلاوی خوای لەسەردەڵێ:پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەڕۆژی خەیبەردا،گۆشتی گوێدرێژو،موتعەی حەرام کرد).
بڕوانە/التهذیب۲/۱۸٦،الاستبصار۳/۱٤۲،رسائل الشیعة ۱٤/٤٤۱

پرسیار کرا لە(ابوعبدالله) ڕەزای خوای لەسەر:موسڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا ژنیان هێناوە،بەبێ شایەت؟وتی:نەخێر. بڕوانە/التهذیب ۲/۱۸۹ (طوسی) لەسەرئەم قسەیەی (ابوعبدالله)،دەڵێ:بۆیە وا وەلأمی داوەتەوە ، چونکە مەبەستی موتعە بووە ،نەك مارەکردنی بەردەوام،هەر بۆیە ئەم دەقەشی لەباسی موتعە داهێناوە.

هیچ گومـان لـەوەدا نیـە، کەئـەم دودەقـە بەڵگەیـەکی یەکلاکـەرەوەن، لەسـەر هەڵوەشاندنەوەی یاسای موتعەو بەتاڵی ئەوکارە.

وە پێـشەوای بـاوەڕدارانیش،سـلاوی خـوای لەسـەر،حـەرامێتی موتعـەی لەپێغەمبـەرەوە (صـلی الله علیـە وسـلم) راگـوێزکردووە،ئەمـەش واتـای ئەوەیە،کەپێشەوای باوەڕداران لەڕۆژی خەیبەرەوە ، دانی بەحەرامێتی موتعەدا ناوە،گومانیش لەوەدا نییە ،کەپێشەواکانیش لـەدوای خـۆی چـاك حەرامییـەتی موتعەیان زانیوە، کەواتە ئێمـە لێرەدا هەڵوێـستە لـە نێـوان دوشـتدا دەکـەین ، لەنێوان چەند هەواڵیکی ڕاگوێزراوو ڕاشکاو ، لە بارەی حەرامییـەتی موتعـەوە ، وەلـەنێوان ئـەو هەواڵانـەی دراونەتـە پـاڵ پێـشەواکان ،دەربـارەی هـەڵنان و کارکردن بەکاری موتعە.

جا ئەمە کێشەیەکی وای ناوەتەوە کە موسوڵمان سەرسام بمێنیّ لـەوەی موتعـە بکات یان نا؟

ئەوەی کە پەسەندە ئەوەیە کە نابێت بیکات ،چونکە حەرامە هەروەك چۆن لـە پێشەوای باوەڕدارانەوە گێڕدراوەتەوە.

وەسەبارەت بەو هەواڵانەی دراونەتە پاڵ پێشەواکان گومان لەوەدا نییە کەدانە پاڵی شتی لەم جۆرە بۆلای ئەم کەسانە ناڕاستـە ،بـەڵکو درۆو بوختـان کردنـە بەدەم ئەوانەوە، چونکە بە هـیچ جۆرێـك ناگونجێـت ئـە و پێـشەوایانە (سـلاوی خوایـان لێبێـت) سەرپێـچی کارێـك بکـەن کـە پێغەمبـەر حـەرامی کـرد بـیّ و ، پێـشەوای بـاوەڕداران لـەدوای ئـەو لەسـەری بـەردەوام بـو بێـت وە ئـەو پێشەوایانەشی کە پشتاو پشت ئەم زانستەیان لە یەکتری وەرگرتووە

کاتێك پرسیار لە(أبو عبدالله) دەکرێت ئایا موسوڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا (صـلی الله علیـە وسـلم) ژن و ژن خوازیـان بـەبیّ شـایەت ئـەنجام داوە؟دەڵـیّ

:نەخێر، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (أبو عبدالله) ئەگەر نەیزانیبێ موتعە حەرام بووە نەی دەوت نەخێر بەتایبەت ، کەپرسیارەکەش بەڕاستی لەبارەی موتعەوە لێی کراوە ،وە (أبوجعفر الطوسی) یش لەڕاوی هەواڵە کەیە ، ئەم باسەی لەباسی موتعەدا هێناوە ،وەك لە پێشەوە ڕابورد.

وەنە بۆ (أبو عبدالله) و نە بۆ پێشەوایانی پێش ئەوو دوای ئەویش نەهاتووە ، کە سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەن ، یاکارێك حەلاڵ بکەن کە حەرامی کردووە، یاشتێك دابهێنن لەسەردەمی ئەودا زانراو نە بوبێت

بەمە ڕون بۆوە کە ئەو هەواڵانەی هاندانیان تێدایە لەسەر موتعەکردن ، بەهیچ جۆرێك پێشەواکان تەنانەت پیتێکیشیان لەبارەوە نەوتووە ،بەڵکو کۆمەڵە کەسێکی لەڕێ دەرچو بەدەم ئەوانیانەوە هەڵبەستووە وە مەبەستیشان تانە دانە لە ئال و بەیت و ،خراپ کردنیان ئەگەر وانییە دەی چۆن ڕاڤەی ئەوە دەکەن کە گوایە موتعەکردن لەگەڵ ئافرەتی هاشمییەکاندا دروستە؟ ئەو کەسەی موتعە نەکات کافرە؟

لەگەڵ ئەوەی بە هیچ ڕێگەیەکی ڕاست و چەسپاونەهاتووە کە هیچ یەکێك لە پێشەواکان موتعەی کردبێت ،ئەگەرچی بۆجارێکیش بو بێت یان بەحەلاڵی زانیبێت ئایە ئەوانە دینێکی تریان هەیە جگە لە ئیسلام؟

جاکاتێ ئەوەمان بۆڕون بۆوە دەگەینەئەوەی کە ئەوانەی ئەم هەواڵانەیان داناوە ،کۆمەڵە کەسانێکی لەڕێ دەرچون مەبەستیان تانەدانە لە ئەهلی بەیت و پێشەواکان ، سڵاوی خوایان لێبێت، چونکە بەڕاستی کارکردن بەو جۆرە هەواڵانە کافرکردنی پێشەوایان دەگەیە نێت....جا ئاگاداربە.

(الكلينى) دەگێڕێتەوە لە (أبو عبدالله) كە ئافرەتێك هات بۆلای (عومەری كوڕی خەطاب) و وتی : من زینام كردووە، ئەوە بو (عومەر)یش فەرمانی دا بە بەرد باران كردنی ، پاشان هەواڵ درایە پێشەوای باوەڕداران عەلی (خوالێی ڕازی بێت) بە ئافرەتەكەی وت چۆن زینات كردووە؟

وتی: لەدەشت دا بەڕێدا دەڕۆیشتم زۆرم تینو بو داوای ئاوم لە كابرایەكی دەشتەكی كرد ، ئەویش وتی بەو مە رجەدەیداتێ كە خۆی تەسلیم بكات ، جاكاتێ تونێتی زۆری بۆ هینام و ترسام بمرم خۆم تەسلیم كردو زینام لەگەڵداكرد ، جا پێشەوای باوەڕداران (خوالێی ڕازی بێت ) وتی: سوێند بەخوای كەعبە ئەمە زینا نییە بەڵكو موتعەیە) الفروع ١٩٨/٢

مەعلومیشە موتعە كاتی خۆی بەڕەزامەندی هەردولا بووە و ،بەویستی خۆیان بووە.بەلاَم لەم گێڕانەوەیەدا ژنەكە زۆری لێكراوە و ناچارو مەجبور بووە ، ئەوكارە بكات لەبەرامبەرچۆڕێ ئاوی خواردنەوەدا ئەم ئافرەتە یاسای داوێن پیسی نایگرێتەوە،هەتا داوا لەعومەر بكات پاكی بكاتەوە لەسەرو ئەمەشەوە كە(ئەمە زۆر گرنگە) ئەمیری بڕواداران خۆی فەرمودەی حەرام بونی موتعە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی خەیبەردا دەگێڕێتەوە دەی ئیتر چۆن دێت فەتوا دەدات كەئەم كارە موتعەیە و،فتواكەشی بۆڕەوایەتی و ڕازی بون بێت بەكاری ئەو پیاو وئافرەتە ؟ خۆ ئەگەر ئەم فتوایە یەكێك لە فێرخوازانی زانست بیدایە ئەوافتواكەی بە بێ بایەخ دەدرایە ئەژمار بەڵكو بەهەڵەو عەیبەش لەسەری ئەژمێردرا دەی ئیتر چۆن فتوایەكی ئاوا دەدرێتە پاڵ پێشەوای باوەڕداران (ڕەزای خوای لێبێت) كەلە پلەی زانست و فەتوادا ئەوپەڕی كەوتووە؟

بەڕاستی ئەوەی ئەم فتوایە دەداتە پاڵ پێشەوای بڕواداران یا کەسێکی قین لەدڵەو دەیەوێت تانەی لێبدات یان مەبەست و ئارەزوی هەیە بۆیە ئەم چیرۆکەی دروست کردووە پاشان داویتییە پاڵ پێشەوای بڕواداران تا ڕەوایی بدات بەکاری موتعە تا بۆخۆی وکەسانی وەك خۆی ڕابواردن بەناوی دینەوە حەلاڵ بکەن هەتا ئەگەرچی ئەمجۆرە فتوایانەش سەر بکێشێ بۆدرۆ هەڵبەستن بەدەم پێشەواکانەوە (سڵاوی خوایان لێبێت)نەك هەرئەوەندە بەڵکو درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەریشەوە(صلى الله عليه وسلم).

بەڕاستی ئەوخراپانەی کە بەهۆی موتعەوە ڕوددەدەن گەورەو چەندین لایەنەیە بۆ نمونە:

١-موتعە پێچەوانەی دەقە شەرعییەکانە چونکە حەلاڵ کردنی شتێکە کەخواحەرامی کردووە.

٢-دروستکردنی چەندین گێڕانەوەی درۆ و هەڵبەستراو بەهۆی ئەم کارەوەو، درانە پاڵی بۆلای پێشەوایان سڵاوی خوایان لێبێت لەگەڵ ئەوەی کەئەم گێڕانەوانە چەندین تانەی قورس و گرانی تێدایە ،بۆ پێشەوایان کە ئەوەی بەئەندازەی گەردیلەیەك باوەڕ لەدڵیا بێت بەم شتانە دڵ خۆش نییە

٣-یەکێك لەخراپەکانی ئەم کارە ڕەوایەتی موتعەیە ،لەگەڵ ئافرەتێکی مێرددارا لەگەڵ ئەوەی ئەم ئافرەتە لەژێر پارێزگاری مێردی خۆشیدا بیت ئەم حاڵە وادەکات کە پیاوان دڵنیانەبن لەهاوسەرەکانیان چونکە جاری وا هەیە ئەو ئافرەتە لەوانەیە کاری موتعە بکات و مێردەکەی ئاگاداری لێی نە بێ بەڕاستی ئەمە ئەو پەڕی خراپەیە بڕوانە/فروع الکافی ٥/٤٦٣، تهذیب الاحکام ٧/٥٥٤،الاستبصار٣/١٤٥

خۆزگە دەزانرا دەبێ پیاو هەڵویستی چۆن بێت گەر دەرکەوت هاوسەرەکەی لەگەڵ پیاوێکی تردا کاری موتعەی کردووە ؟؟!!

٤- هەروەها باوکانیش دڵنیا نابن لەکچەکانیان چونکە لەوانەیە بەبێ ئاگاداری باوکان کچەکانیان کاری موتعە بکەن لەناکاو باوك ڕوبەڕوی ئەوە دە بێتەوە کە کچەکەی سکی پڕە ......، لەبەرچی؟ چۆن چۆنی ؟نازانێ..لەکێ؟ لەوانەیە لەگەڵ کەسێك دا هەوسەر گیری کاتی "موتعە"ی کردبێت بەلاَم ئەو کەسە کێیە؟ نازانێ چونکە وازی لێهێناوە و ڕۆیشتووە

٥- بە ڕاستی زۆربەی ئەوانەی کاری موتعە دەکەن لەگەڵ کچی خەڵکیداو بەڕەوای دەبینن بەلاَم خۆئەگەر بێت و کەسێك بێت و بیەوێت لەگەڵ کچەکەیدا موتعە بکات یا کەسێکی نزیکیان ، ئەوا بەهیچ جۆرێ ڕازی نابێت چونکە پێی وایە ئەمە کارێکە وەك داوێن پیسی وبەعەیبە بەسەریدا دەشکێتەوە ئەم هەستەشی لە ئەنجامی ڕابواردنیدا بۆ دروست دەبێت لەگەڵ کچی خەڵکی دا ، بێگومان بە هیچ جۆرێك ئامادەنییە کچەکەی خۆی لەکەسانی تر مارە ببڕیت بۆکار ی (موتعە) بەو واتایەی بۆخۆی بەڕەوای دەبینێت لەگەڵ کچانی خەڵکی دا ڕابوێرێ بەلاَم لەبەرامبەردا لەسەر خەڵکانی قەدەغەو حەرام دەکەن ،لەگەڵ کچەکانیان ڕابوێرن.

دەی باشە ،ئەگەر(موتعە) شەرعییە،یاخود ڕەوایە ئیتر بۆئەم کەسانە، بە لایانەوە قورس وگرانە خەڵکی تر لەگەڵ کچەکانیان ،یاخزمەکانیان موتعە بکەن ؟

٦- لەکاری موتعەدا شایەت وئاشکراکردن و،ڕازی کردنی کەسی کچەکە بە مەرج نەگیراوە وە بە هیچ جۆر ێکیش پیاوو ئافرەتەکە میرات لە یەکتری نابەن بەڵکو تەنها ئافرەتەکە وەك کرێگرتەیەك وایە لەم نێوەندەدا وەك ئەم بۆ

چونە دەدەنە پاڵ (أبو عبدالله) ڕەزای خـوای لێبێـت دەی ئـیتر چـۆن ڕەوایـەو دەبێت بلاّو بێتەوە ، لە نێو خەڵکیدا؟

٧- بە ڕاستی (موتعە ) دەرگا والآ دەکات لەبەردەم ئەو کەسانەدا کە خـەریکی داوێـن پیـسین تـا ئـەوکارەیان بـەناوی دینـەوە پـەردە پـۆش بکـەن سەرئەنجامیش سەردەکێشێ بۆ ناشرین کردنی دین و دیندارەکانیش.

بەم جۆرە زیانەکانی موتعە مان بۆ ڕون بۆیەوە لەڕوی دینـی و کۆمەلآیـەتی و، ڕەوشتی یەوە هەر لەبەر ئەمەشەکە حەرام کرا ، خۆ ئەگەر بـە ڕژەوەندییـەکی تیادا بەدی بکرایە ئەوە حەرام نەدەکرا ، بـەلاّم لەبـەر ئـەوەی خراپـی زۆری لێ دەبێتەوە ، پێغەمبـەر(صـلی الله علیـە وسـلم) حـەرامی کـردووە ، وەپێـشەوای باوەڕدارانیش ڕەحمەتی خوای لێبێت حەرامی کرد

ئاگادارکردنەوەیەك:

جارێکیـان پرسـیارم لـە ئیمـام (خـوئی)کـرد ، دەربـارەی وتەکـەی پێـشەوای باوەڕداران ، لەبارەی حەرامی موتعەوە لە ڕۆژی خەیبەردا و، هەروەها وتەکـەی (أبو عبد الله )، کاتێ وەلآمـی پرسـیار ی ئـەوەی دایـەوە کـە پرسـیاری لێکـرا دەربارەی ئەوەی کە ئایا لەسەر دەمی پێغەمبـەردا (صـلی الله علیـە وسـلم) ، موتعە بە بێ شایەت بلاّو بووە؟پرسیار ی ئەم دوانەم لێکرد.

ئیمـام (خـوئی)وتـی وتەکـەی پێـشەوای بـاوەڕداران ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت لەبارەی حەرامییەتی موتعە لەڕۆژی خەیبەردا تەنها مەبەسـت ئـەو ڕۆژەبـووەو بەس ، ئیتر حەرامییەتییەکەی بۆ لەوەو دوا بەردەوام نییە.

دەربارەی وەلآمەکەی (ابو عبد الله )ش وتی: بۆیە (ئـەبو عبداللـە) وا وەلآمـی ئەو کابرایەی داوەتەوە ، بە فێلّ و چاوبەست بووە ،واتە بۆ (تو‌قیە) بووە ، کە

ئەم جۆرە کارەش لە ناو زانایانی ئێمەدا یەك دەنگی لە سەرە (واتە: توقیییە کردن).

منیش دەڵێم ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەیە کە زانایانمان تەیان پێکاوە چونکە حەرامییەتی موتعە لەڕۆژی خەیبەردا ، هاوکات بو لەگەڵ حەرامییەتی گۆشتی گوێدرێژ ی ماڵی ، ، دەی حەرامییەتی گۆشتی گوێدرێژ لە ڕۆژی خەیبەرەوە ، ئەم یاسایە ، بەردەوامە تا ئەمڕۆ و بەردەوامیشە تا کۆتایی دنیا.

کەواتە: بانگەشەی تایبەت کردنی حەرامییەتی موتعە تەنها بەڕۆژی خەیبەرەوە

بانگەشەیەکە بەبێ بەڵگە بەتایبەت کەحەرامییەتی گۆشتی گوێدرێژ ی ماڵی ، کە هاوتای موتعەیە ، لە حەرامییەتیشدا تا ئەمڕۆ ش هەر بە حەرامییەتی ماوەتەوە.

لەسەرو ئەمەشەوە ، خۆ ئەگەر حەرامییەتی موتعە تەنها تایبەت بوایە بە ڕۆژی خەیبەرەوە ، ئەوا دەبوایە لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم ) بە ڕاشکاوی شتێك بهاتایە، بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو حەرامێتییە ؛ لەگەڵ ئەوەی پێویستە ئەوەمان لە یاد بێت ، کە هۆ کاری ڕەوایەتی (موتعە) سەفەرو جەنگ بووە دەی ئیتر چۆن دە بێت لە جەنگ و ، سە فەرو دورکەوتنەوە لەماڵ و دوری لە خێزان و، هاوسەر، شتێك کە زۆر پێویست بێت حەرام بکرێت ، بەڵام لەکاتی ئاشتی و جێنشینیدا ڕەوا و حەڵاڵ بێ؟

واتای وتەکەی پێشەوای باوەڕداران ، کە فەرمویەتی: لەڕۆژی خەیبەردا موتعە حەرام کرا مەبەست ئەوەیە کە حەرامییەتی موتعە لەڕۆژی خەیبەر ەوە دەستی پێکردووە ، وەسەبارەت بە وتەی زانایانیشمان ئەوە بەڕاستی جگە لە یاری کردن و گاڵتە کردن بە دەقەکان شتێکی تر نییە.

ئەوەی کەڕاست بێت ،حەرام بونی (موتعە )و گۆشتی گوێدرێژی ماڵی پێکەوە لەڕۆژی خەیبەردا حەرامێتیان دابەزیوە و تارۆژی دوایی ئەم یاسایە بەردەوامە ، ئیتر بەڕاستی هیچ پاساوێك نییە بۆ هەڵگێڕانەوەی وتەکەی پێشەوای باوەڕداران (ڕەحمەتی خوای لێبێ) بەمەبەستی تێرکردنی ئارەزوی سێکسی و گەڕانی بەردەوام بەدوا کچی جوان و کەشخەدا بۆڕابواردن لەگەڵیاندا، بەناوی دین و لەسەر حسابی دین.

وەسەبارەت بە وتەکەی (أبو عبدالله) کەوەڵامی پرسیارەکەی پێدایەوەو ،ئیمام(خوئی)دەڵێ بۆ توقیە بووە.

دەڵێم:پرسیارکەرەکە یەکێك بووە لەدەستەو لایەنگرانی (أبو عبدالله) هەربۆیە هیچ پێویست ناکات (أبو عبدالله) چاوبەست لەبەردەمیدا بکات بەتایبەت کە ئەم کارە یەکانگیرە لەگەڵ ئەو ڕیوایەتەی لە پێشەوای باوەڕدارانەوە ڕەزای خوای لێبێت گێڕدراوەتەوە لەبارەی حەرامییەتی موتعە لە ڕۆژی خەیبەردا.

ئەو موتعەیەی کەزانایانی ئێمە بەڕەوایان داناوە ماف دەدات بە پیاوان کەبەبێ ئەژمار لەگەڵ ئافرەتدا ڕابوێرن لەیەك کاتدا ئەگەر چی هەزار ئافرەتیش بن دەبێ چەندکەس هەبوبێ بەناوی "موتعە"وە لەگەڵ ئافرەتەکەو دایکەکەشیدا ڕابیواردبێت یا ئافرەت و خوشکەکەی، یا ئافرەت و پورەکەی ،هەستیشی پێنەکردبێ.

جارێکیان ئافرەتێك هات بۆلام ،کە ڕوداوێکی وای لێ ڕودابو ، هەواڵی دامێ کەیەکێك لە سەیدەکان کە (سید حسین الصدر)بو ، پێش زیاتر لە بیست ساڵ لەگەڵ ئەم ئافرەتەدا ڕابیواردووە و پاشان سکی پڕکردووە پاش ئەوەی کەلێی تێردەبێت ، لێی جیادەبێتەوە

لەپاش ماوەیەك كچێكی دەبێت وە ئافرەتەكە سوێندی خوارد كە ئەو سكەی لە(حسین الصدر)بووە ،چونكە لەو ماوەدا جگە لەو لەگەڵ كەسی تردا موتعەو ڕابواردنی نەكردووە

لەپاش گەورەبونی كچەكەو ،كەدەبێتە كچێكی جوان و قەشەنگ و كاتی شوكردنی دێت دایكەكە بۆی دەردەكەوێ كەئەم كچەی سكی هەیە ،كاتێ پرسیاری سك پڕییەكەی لێ دەكات ،كچەكە پێ ی دەڵێ: كەلەگەڵ هەمان كەسدا واتە (حسین الصدر) موتعەی كردووەو سكی پڕكردووە ، ئیتر دایكە سەرسام دەبێ وزۆری نامێنێت عەقڵی لەدەست بدات چونكە پێی دەڵێ ئەو پیاوە باوكییەتی وباسی خۆی بۆكچەكەی دەگێڕێتەوە ،جاببینە چۆن وەختی خۆی لەگەڵ دایكیداڕایبواردووەو ئێستاش دێت لەگەڵ كچی ئەم ئافرەتەدا ڕادەبوێرێ ،كە هەر دەكاتە كچی خۆی؟"

پاشان ئەوئافرەتەهات بۆلام ، پرسیاری كرد ، لەبارەی هەڵوێستی (حسین الصدر) لەبەرامبەر ئەم ئافرەتەو كچەكەیدا ، بەڕاستی ڕوداوی لەم چەشنە زۆر زۆرە،وە كەسی وایە موتعەی لەگەڵ كچیدا كردووە ، لەدوایدا دەركەوتووە كە خوشكییەتی، واتە بەهۆی موتعەوە یا هەبووە ، موتعەی لەگەڵ ژنی باوكی خۆیداكردووە

لەم چەشنە ڕوداوە لە ئێراندا ئەوەندە زۆرە كەكەس ناتوانێ ئەژماریان بكات، بەڕاستی ئێمە لەم فەرمودەیەی خوای پەروەردگارەوە كە دەفەرموێت (وَلْيَسْتَعْفِفِ الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِيَهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ) سورة النور/٣٣ وادەبینین ،كەهەركەسێك توانای نەبو ، هاوسەرگیری شەرعی ئەنجام بدات ،بەهۆی نەبونی هۆكاری ئابورییەوە با خۆی بەدور بگرێت ، لەكاری داوێن

پیسی هەتا خوای گەورە دەست گیرۆیی دەکات لە سوزو میهرەبانی خۆیەوە تابەڵکو ئەوکات ببێتە خاوەنی هاوسەری شەرعی خۆی.

جالەم ئایەتەوە ئەوە وەردەگیرێت کەئەگەر (موتعە) ڕەوا بوایە ئەوا خوا بەهیچ جۆرێك فەرمانی نەدەکرد بەخۆگرتنەوە لەداوێن پیسی وچاوەڕوانی کردن تائەوکاتەی دەتوانرێ کاری هاوسەرگیری بەئەنجام بگەیەنرێ ، بەڵکو خوا ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد ، کە بچن موتعەبکەن لە جیاتی ئەوەی ئەو هەموماوەیە ، چاوەڕوانی بکەن بەو هەموتین وکەف وکوڵە سێکسییەوە.

وە خوای گەورە دەفەرموێت (وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ طَوْلًا أَنْ يَنْكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ) تادەگاتە ئەو جێگەیەی کە دەفەرموێت (ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ وَأَنْ تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) النساء/٢٥

واتە:"هەرکەسێك لە ئێوە نەی توانی و ئەوەندە دارایی نەبوو کە ئافرەتێکی ئازادی باوەڕدار بخوازێت ئەوە باڵەو کەنیزەکە باوەڕدارانەی کەهەیە ،بخوازێ ،...."ئەم هێنانی کەنیزەکانەش{ بەو مەرجانەیە کەلە ئایەتەکەدا باسکراوە ،کەنابێت داوێن پیس بن } بۆکەسێکە کە بترسێ لەوەی گەرژن نەهێنێ،دەکەوێتە نێوکاری زیناوە بەڵام خۆ ئەگەر ئارامبگرن و خۆڕاگر بن ئەوە چاکترە بۆتان و خوای گەورەش لێبوردەو بەسۆزە.

ئەوەتا خواڵەم ئایەتەدا ڕێنویی خەڵکی دەکات ،کەئەوانەی لەبەردەست کورتی ناتوانن هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانی ئازادو باوەڕداردا بکەن ، باڵەکەنیزەکە باوەڕدارەکان بهێنن "چونکە ئەمانە تێچونی داراییان کەمتر بوو"خۆئەگەر نەیانتوانی ئەم جۆرە ئافرەتانەش بخوازن ،ئەوە خوافەرمانیان پێ دەکات کە خۆڕاگربن .دەی ئەگەر "موتعە"ڕەوا بوایە ،ئەوا خوا ڕێنمویی دەکردن ،کەئەوە بکەن بەڵام نەیکردووە

وەلێرەدا پێویستە چەند دەقێکی تر بهێنین لە پێشەوایانەوە (سلاویان لەسەر)لەبارەی حەرامییەتی (موتعە)وە

١-عبد الله بن سنان،دەڵێ لەبارەی (موتعە)وەپرسیارم لە (أبو عبدالله)ڕەزای خوای لێبێ،کرد ئەویش وتی:خۆت بەوکارە پیس مەکە "لاتدنس بها نفسك". بحار الأنوار ١٠٠/٣١٨.

ئەمە بەڕاشکاوی لە وتەکەی (أبو عبدالله)دا ،دەردەکەوێ :کە (موتعە)کردن نەفس پیس دەکا، ئەگەر کارێکی ڕەوابوایە ،ئەوا ئەم جۆرە حوکمەی نەدەبوو،پێشەوا صادق(أبو عبدالله) هەر بەوەندەوە نەوەستاوە ،بەڵکو بەڕاشکاوانە دان بەحەرامێتیا دەنێ.

٢-عەممار،دەڵێ أبو عبدالله -خوالێی ڕازی بێ -بەمن وسولەیمانی کوڕی خالد ،ی وت : بزانن موتعەکردن لەسەر ئێوە حەرامکراوە"قد حرمت عليكما المتعه" فروع الكافي ٢/٤٨،وسائل الشيعة ١٤/٤٥٠.

٣-هەتا (أبوعبدالله )ڕەزای خوای لێبێ ،دەستوری وابو،کە سەرزەنشتی هاوەڵانی خۆی دەکرد لەسەرکاری،موتعە و،ئاگاداری دەکردنەوە لەنەکردنی کاری لەم چەشنە وەك پێیان دەڵێ{ئایە بۆ کەسێ لە ئێوە شەرم ناکات کە جێگەیەك دەبینێ ،دەچێ ئەوە دەخاتە سەر برا و هاوڕێ چاکەکانی} فروع الكافي٢/٤٣،وسائل الشيعة١٤/٤٤٩.

٤-وەکاتێك کە(علي بن يقطين)پرسیاری موتعە لە (أبو الحسن )ڕەزای خوای لێ بێ،دەکات لەوەڵامدا پێی دەڵێ:{تۆچیت داوە لەکاری وا ؟خوای گەورە بێ نیازی کردوی لەشتی وەها} فروع الكافي٢/٤٣،وسائل الشيعة١٤/٤٤٩.

بەڵێ بەڕاستی خوای گەورە بەهۆی هاوسەرگیری حەڵاڵەوە خەڵکی بێ نیازکردووە ،لەکاری (موتعە).

هەرلەبەر ئەمەیە کە هیچ کەسێك نەیگێراوەتەوە ،کە هیچ یەکێك (موتعە)ی لەگەڵ ،ئافرەتێکی ئالی بەیت (سلاوَیان لەسەر)کردبێ خۆ ئەگەر حەلاَڵ بوایە ئەوا ئەوان دەیانکرد.

بۆ پشتگیری ئەم بۆچونە:

(عبد الله بن عمیر) بە (أبو جعفر)ڕەزای خوای لێبێ ،دەڵێ { خۆشحاڵ دەبی ئەگەر هاتوهاوسەرەکەت و کچەکانت و خوشکەکانت و کچی مامەکانت،کاری موتعە بکەن؟(أبو جعفر) ڕەزای خوای لێبێ،ڕوله (عبدالله)وەردەگێڕێ } فروع الکافی ٢/٤٢، التهذیب ٢/١٨٦.

بەم جۆرە بۆ هەموو موسوڵمانێکی ژیر دوپات بۆوە ،کە بەڕاستی (موتعە ) حەرامە ، چونکە پێچەوانەی دەقی قورئان وسوننەت و،وتەی پێشەوایانە(سلاوَیان لەسەر)

ئەوەی بڕوانێت لەو ئایەتە قورئانی و ئەو دەقانەی ڕابورد ،لەبارەی حەرامی (موتعە)وە { ئەگەربەڕاستی بەدوا حەق وڕاستیدا وێڵە}ئەوا ماف بەخۆی دەدات ،کەبڕیار بدات لەسەر پوچەڵکردنەوەی ،ئەوگێڕانەوانەی هاندانی تێدایەلەسەر (موتعە)کردن چونکە پێچەوانەی ڕاشکاوانەی ،قورئان و ئەو سوننەتانەیە،کەلە ئەهلی بەیتەوە ڕاگوێز کراوە ،سلاوَیان لەسەر ،هەروەها چەندین خراپەشی لێدەبێتەوە کەلە ژمارەنایەن،کە هەندێکمان لە پێشەوە ڕوونکردەوە

شتێکی زانراوە دینی ئیسلام بۆیە هات ،تا خەڵکی هان بدات لەسەر بەها بەرزەکان ڕێگری بکات لە ڕەوشتە نزمەکان هات تا ئەو بەرژەوەندیانە بۆبەندەکان بهێنێتەدی کەژیانیانی پێ ڕێك دەبێت گومانیش لەوەدا نییە کە (موتعە) بەهیچ جۆرێك ژیانی پێ ڕێك ناکرێت خۆئەگەر وەك گریمانەیەکیش بەرژەوەندییەکی تاکە کەسییەکی پێ بێتەدی ئەوا چەندین خراپەی بۆدەسازێنێ

که به پوختی لەخاڵەکانی ڕابوردودا باسمان کرد.

بەڕاستی بلاو بونەوەی (موتعە) سەردەکێشیٚ بۆ داوێن پیسی و ،خواستنی (قوز) واتای ئەمەش ئەوەیە که پیاوەکه هاوسەرەکەی خۆی دەداتە پیاوێکی تر ئیتر ئەوکات بۆی ڕەوایە بەهەموجۆرێك ڕابوێریٚ لەگەڵیدا چۆنی بوێت وئارەزوی بکات ، گەر پیاوێك بیەوێت بچێت بۆ سەفەر هاوسەرەکەی لای دراوسێکەی یا هاوڕێکەی یاهەرکەسیٚ که پیاوەکه هەڵیدەبژێریٚ هاوسەرەکەی لادادەنێت ئیتر لەدرێژایی ئەو ماوەیە کەتاپیاوەکەی دێتەوە ئەوکەسە بۆی هەیە به ویستی خۆی لەگەڵ ژنی ئەو کەسەدا ڕابوێریٚ هۆکارەکەکەش دیارە ئەویش ئەوەیە کەتا مێردەکە دڵنیا بێت لەوەی ژنەکەی زیناو داوێن پیسی نەکات ،لەماوەی دیارنەبونی مێردەکەیدا ،! ! بەڕاستی سەیرە.

ڕێگەیەکی تر بۆ خواستنی شەرمگە(فرج) هەیە ئەویش ئەوەیە ئەگەر کەسێك بووە میوان لای کەسیٚ یا کۆمەڵیٚ ئەوانیش ویستیان ڕێزی بگرن ئەوە خاوەنی ماڵەکه بەدرێژایی مانەوەی کابرای میوان ژنەکەی خۆی لادادەنیٚ و میوانیش بەویستی خۆی هەموشتێکی بۆ ڕەوایە لەگەڵیدا بیکات بەداخەوە کەئەم شتانە وەك گێڕانـــەوە گێڕدراونەتـــەوە گێڕانـــەوەکانیش دراونەتـــە پـــاڵ ئیمامی(صادق)و(أبوجعفر) ی باوکی سلاویان لەسەر

(الطوسی) له (أبوجعفر)سلاوی لەسەر دەگێڕێتەوە که (محمد) به (أبوجعفر)ی وتووە پیاو بۆی هەیە قوز ی جارییەکەی بۆ براکەی حەلاڵ بکا؟ ئەویش وتویەتی :بەڵیٚ، هیچ کێشەیەکی تێدا نییە بۆی ڕەوایە ، هەموشتیٚ لەو ئافرەتە بکات ) الاستبصار٣/١٣٦

(الکلینی) و(الطوسی) له (محمد بن مضارب) دەگێڕنەوە ،کەوتویەتی:

أبو عبدالله ، ڕەزای خوای لێبێت پێ ی وتم: ( ئەی محمد ها ئەم جارییە ببە بۆ خۆت باخزمەتت بکات و لەگەڵیشیدا ڕابوێرە وە هەرکات دەرچویت ئەوا بۆمان بگێڕەوە ) الکافی،الفروع ٢/٢٠٠، الاستبصار٣/١٣٦

دەڵێم: ئەگەر هەمو مرۆڤایەتی کۆببنەوە و سوێند بخۆن کە ئیمامی (صادق ) و (باقر)سلاّویان لەسەر ، ئەم قسانەیان کردبێ من بەڕاستی نازانم وباوەڕم نییە شتی وایان وتبێ

ئەم دو پێشەوایە سلاّویان لەسەر، زۆر لەوە بەرزترو گەورەترن ، کەلەم جۆرە قسە پڕو پوچانە بکەن یا لەم کارە قێزەونانە، یا ئەم دەلاّلییە حەلاّڵ بکەن کە لەگەڵ بەها بەرزەکانی ئیسلامدا دژ دەوەستێت ، گومان لەوەدانییە کە پێشەواکان سلاّویان لەسەر، ئەم زانستەیان چین بە چین و پشت بە پشت وەرگرتووە ، کەواتە درانە پاڵی شتی لەم جۆرە قسەو کارە ،درانە پاڵە بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەمەش واتای ئەوەیە کەئەم کارە مۆڵە تێکی خوایی بێت.

لەسەردانماندا بۆولاّتی(هندستان) و چاوپێکەوتنمان لەگەڵ پێشەوا شیعەکان وەك بەڕێز(النقوی) و کەسانی تر ،لامان‌دا بەلای دەستەیەك لە هندۆسەکان ومانگا پەرستەکان و سیخەکان و کەسانی تر لەشوێنکەوتوانی دینە بت پەرستەکانی ترو خوێندنەوەی زۆرمان بۆیان ، نەمان دی هیچ یەکێ لەم دینە پوچانە ئەم کارە واتە(موتعە) بەڕەوابزانێت و ، بۆشوێن کەوتوانی خۆیان حەلاّلی بکەن

دەی ئیتر چۆن دەگونجێ بۆ پەیامی ئیسلام ، کە شتی لەم جۆرە کارە بێ نرخە ، بەڕەوابیبینێ ، کەبەڕاستی لەگەڵ سادەترین بنەماکانی ڕەوشتدا ،یەکناگرێتەوە و ، دژ دەوەستێ.

جارێك سەردانی حەوزەی (قائمیە)مان كرد ، لەوڵاتی ئێران دەبینین لەوێ پێشەوا شیعەكان ،خواستنی قوز بەحەلاڵ و ڕەوا دەبینن ، یەكێ لەو بەڕێزانەی كە فتوای حەلاڵیەتی ئەم كارەی داوە ،(سید لطف الله الصافی)و كەسانی ترە ، هەربۆیە لەگشت ولاتی ئێران دا (خواستنی شەرمگە – فرج –) كارێكی زۆر بلاوە ، ئەم كارە بەردەوام بو هەتا دوارۆخانی دەسەلاتی (محمد رضا شای پەهلەوی)وهاتنی ئایەتولای هەرەبەرز ئیمام(خومەینی موسەوی)

وەلەدوامردنی ئیمام (خومەینی) ش ئەم كارە هەربەردەوام بو بەڕاستی ئەمە یەكێك بو لەوهۆكارانەی[1]،كە سەری كێشا بۆ فاشیل بونی دەوڵەتێكی شیعە ، لەسەردەمی نوێدابەڕاستی شیعەكان ،لەهەمو ولاتانی جیهانەوە لەو دەوڵەتەیان دەڕوانی تاوای لێهات زۆرێك لەبەڕێزەكان بێ بەری بونی خۆیان لەودەوڵەتەدەربڕی ، بەڵكو هەتاهێرشیشیان دەكردە سەری بۆ نمونە

ئەوا هاوڕێ ی بەڕێزمان ،عەللامە ،سەید (موسی الموسوی) كەكتیبێكی دانا بەناوی (الثورة البائسة) شۆڕشی بێ هیوا ، وەچەندین لێكۆڵینەوەو بلاو

---

[1] بەڕاستی من وزۆرێك لەبەڕێزەكانیش بێ هیوابوین لە حوكمەت ودەوڵەتەكەی (ئیمام خومەینی) چونكە ئێمە وامان دانابو ئێران ببێتە پێگەی ئیسلام بەلام بەداخەوە لەناوبردنی ناڕازی بوانی ئەو حوكمەتە وخوێن ڕشتنیان لەگەڵ خێزانەكانیان و دروست بونی چەندین ڕوباری خوێن بەبێ هیچ سۆزێك دەستی پێكرد ، بەڕاستی واگومان دەبرا كە ئەم حوكمەتە زاڵ بێت بەسەر هەمو ئەو خراپانەی كەبنەماڵەی پەهلەوییەكان دروستیان كردبو بەلام خراپە لەدواهاتنی ئیمام خومەینیش هەربەردەوام بو ،حەمام وگەرماوەكان هەرتێكەڵە بەپیاو ئافرەتەوە ،داوێن پیسی كەوەختی خۆی ئاشكرابو بوبەنهێنی بەلام بەشێوەیەكی فراوانتر ڕوتی ئافرەت چۆن بو هەر وەك خۆی مایەوە بەوجۆرە ئافرەت بەپانتۆڵ وتەواوی جوانییەكانییەوە دێتە دەرەوە ،تەنها ئەوەندەیەسەرداپۆشین وهیچی تر ،ئەمە جگەلەبەرتیل خۆری ودزی و چەندین شتی تر كەهەیە.

کردنەوەی وتار ، لەهێرش کردنەسەر دەوڵەتەکەی (خومەینی) و ڕونکردنەوەی هەڵەکانی.

سەید ( جواد الموسوی) دەڵێ: بەڕاستی شۆڕشی ئیسلامی ، لەئێران بەس تەنها ناوە و هیچی تر.

وە (ئایەتولآی هەرەبەرز سەید محمد کاظم) و(یەعتەمید داری) لەهەرەناڕەزاکان بون ، لەو دەوڵەتە چونکە لادانێکی تەواویان پێوە بینی لەڕێگەی ئیسلامدا وەچەندین وزۆرێك لەوبەڕێزانە کە ناسینی تایبەتیم هەیە لەگەڵیاندا ڕەخنەیان لەحوکمەتەکەی ئیمام خومەینی دەگرت ولێی هەڵدەهاتن

جێگەی داخە کەزۆرێك لەو بەڕێزانە فتوای حەلآڵی (خواستنی شەرمگە — فرج —) یان داوە وەزۆرێك لەخێزانەکان لەباشوری عێراق لەشاری بەغداد لەناوچەی (الثورة) خەریکی ئەمکارەن لەسەر فتوای زۆرێك لەبەڕێزەکان ،لەوانە(سیستانی و،صدروشیرازی و،طباطبائی وبروجردی) و کەسانی تر جگەلەمانە هەتازۆرێك لەمانە ئەگەر میوانێکی بێت ،ژنەکەی جوان بێت داوای لێدەکات کەپێی بخوازێت ،ئیتر هەتاڕۆشتن ئەم لەگەڵیدا ڕادەبوێرێت

ئەوەی پێویستە ئاگادارکردنەوەی خەڵکی یە لەم کارە قێزەونە ،وەبەهیچ جۆرێك فتوای ئەوبەڕێزانە قبوڵ نەکەن لەڕەوایی ئەم کارەقێزەونەی کەئەودەستانەی لەپشتەوەیە بۆناشرین کردنی دین وبلآوکردنەوەی لەناوخەڵکیدا

کارەکە هەربەوەوە نەوەستاوە بەڵکو هەتا چونەلای ئافرەتیشیان لەدواوە حەلآڵ کردووە و ، چەندین ڕیوایەتیان گێڕاوەتەوەو داویانەتە پاڵ پێشەواکان (سلآوی خوایان لێبێ)

(الطوسی له،عبدالله بن أبی یعفور)دەگێڕێتەوه کەدەڵێ لە(أبوعبدالله) ڕەزای خوای لێبێت، پرسیارم کردلەبارەی ئەوەی پیاو لەدواوه بچێتەلای ئافرەت ،وتی:قەیناکە ئەگەر ئافرەتەکە خۆی ڕازی بێت ،وتم: ئەی ئەو ئایەتەی کەدەفەرموێت(فأتوهن من حيث أمركم الله)

لەوێوەوه بچنەلای ئافرەتان کەخوا فەرمانی پێداون ،واتەلەپێشەوه ئەویش وتی:ئەوه بۆمنداڵ بونه،کاتێ کە سێ ویستی منداڵیان ببێت یان بۆمنداڵ بون لەوجێگەیەوه بچێتەلای ئافرەتان ،کە خوافەرمانی پێکردون، چونکه خوادەفەرموێت(نساؤكم حرث لكم فأتواحرثكم أنى شئتم) ژنەکانتان کێڵگەن بۆتان لەکوێوه ویستان بچنەلایان الاستبصار ٣/٢٤٣.

(الطوسی) دەگێڕێتەوه لە (موسی بن عبد الملك) ئەویش لەپیاوێکەوه دەڵێ: پرسیم لە(أبو الحسين الرضا)،ڕەزای خوای لێبێت،دەربارەی چونەلای ئافرەت لەدواوه وتی :ئایەتێك لەقورئاندا ئەم کارەی حەڵاڵ کردووه ،وتەکەی لوط ڕەزای خوای لێبێت ،کەدەڵێ :(هؤلاء بناتی هن أطهر لكم) ئەوه کچەکانم ئەوانە بۆ ئێوه پاکتره ،وه (لوط)دەیزانی کە هۆزەکەی قوز یان ناوێت ) الاستبصار /٢٤٣/٣

(الطوسی)لە (علی بن الحکم) دەگێڕێتەوه و ،وتویەتی ،بیستم (صفوان)دەیوت :بە(رضا)م وت ڕەزای خوای لێبێ،یەکێك لە دۆستەکانت فەرمانی پێداوم کەپرسیارێکت لێبکەم ،ئەو خۆی ڕوی نەهاتووه پرسیارەکەت لێبکاو شەرمی لێکردویت ،وتی: چی یه پرسیارەکەت؟وتی: ئایا پیاو دەتوانێ لەدواوه بچێته لای ئافرەت ،لەقنگیەوه؟وتی: بەڵێ بۆی هەیە شتی وابکات). سەرچاوەی پێشو

گومـان نییـه ،لـەوەدا ،کەئـەم گێڕانەوانـە،دژ بـەدەقی قورئانـە ،خـوای گـەورە دەفەرموێ:

(ویسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ) البقرة/٢٢٢

پرسیارت لێدەکەن،ئـەی محمـد لـەبارەی سوڕی مانگانـەی ،ئافرەتـان تـۆبڵێ: سـوڕی مانگانـە ئـازارە بـۆ ئافرەتـان لەوماوەیـەدا مەچـنەلایان (جـوت بونیـان لەگەڵدا مەکـەن ) لێیـان نزیـك مەبنـەوە تاخۆیـان پـاك دەبنـەوە لـەم ئایەتـەدا ئەگـەر چـونە دواوەی ئافرەتـان ،ڕەوابوایـە ئەواتـەنها ،فـەرمانی پێـدەکردن کەلەپێـشی ئـافرەت لـەم مـاوەدا خۆیـان بپـارێزن و ،دەیفـەرمو(خۆتـان لـە پێشەوەی ئافرەتان بپارێزن لەکاتی سوڕی مانگانەیاندا)

بـەلام چـونکە چـونەدواوەی ئـافرەت کـارێکی حەرامـە ،فـەرمان کـراوە لـەکاتی سـوڕی مانگانـەدا ،لـەدواوەو ،پێـشەوەی ئـافرەت خـۆ بپـارێزن وەك دەفەرموێت(ولاتقربوهن).پاشان دوایی خوای گەورە ڕونی دەکاتـەوە کـەپیاوان لەکوێوە بچنەلای هاوسەرەکانیان و،دەفەرمێ:(فاذا تطهرن فأتوهن من حيث أمركم الله) البقرة/٢٢٢

هەرکاتێ پاك بونەوە ئەوا لەو جێگەیەوە بچنەلایان کە خوا فەرمانی پێکردون وە خوای گەورە فەرمان دەکات ،کەلە پێشەوەی ئافرەتان واتـە (شـەرمگەیان- فـرج - ) بـچنەلایان دەفـەرموێ(نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ)البقرة/٢٢٣.

خێزانەکانتان کێڵگەن بۆتان لەهەرکوێوە دەتانەوێت بچنە کێڵگەکانتانەوە.

(حرث) کێڵگەیە لەم ئایەتە دا مەبەست پێی ئەو جێگەیەیە کەمنداڵی لێوە دەبێت

گێڕانەوەکەی (أبو اليعفور) لە(أبو عبد الله) ئەوەدەگەیەنێت ئەو جێگەیەی منداڵی لێوە دەبێت و داوادەکرێ لەپێشی ئافرەتەوە دەبێ چونکە خوای گەورە دەفەرموێ ( نساؤکم حرث لکم) ئەمە،ئەو جێگەیەیە کەمنداڵی لێ دێتە دەرەوە مەفهومی گێڕانەوەکە ئەوەدەردەخات ،کەپێش (شەرمگە – فرج– ) ی ئافرەتان بۆدروست بونی منداڵ بەکاردێ و سودی لێ دەبینرێ بەلآم چێژ وەرگرتن ولەزەت بینین ئەوالەدواوە (قنگی) یەوەیە ،کەئەم تێگەیشتنە لە هێنانی گێڕانەوەکەدا زۆربەڕونی دیارە

ئەم تێگەیشتنەش زۆر هەڵەیە ،چونکە پێش(شەرمگە فرج –)ی ئافرەت ، تەنها بۆ مەبەستی منداڵ بون دروست نەکراوە ،بەڵکو بۆچێژ ولەزەت بینینیشە ، لەهەمان کاتدا ئەمەش دیاریدەیەکە لەنێو هاوسەرگیریدابەدی دەکرێ؛هەرلە ئادەم ەوە هەتائەوکاتەی خواخەڵکی لەسەرزەویدادەهێڵێ ،وەبەڕاستی (أبوعبدالله)ش زۆرلەوە گەورەترو بەڕێزترە کەئەم قسە هیچ وپوچانە بکات ،خۆئەگەروادابنێین کەچونەلای ئافرەت لەدواوە دروست بێت ،ئەوانەوکاتەئەم ئایەتە لێرەدا هیچ واتایەکی نابێ کەدەفەرموێت( فاذا تطهرن فأتوهن من حيث أمركم الله) البقرة/٢٢٢

چونکە وەك زانراوە لەسەر ئەوئەگەرەی باسمان کرد چونە لای ئافرەت لەپێشەوەو،لەدواوە دەبێت ئیتر جێگەیەکی سێ یەم نییە کەبتوانرێ خەڵکی لێوەی بچێتەلای ئافرەت ،کەواتە هیچ واتایەك بۆئەم ئایەتەو ئەو فەرمانەشی تێیدا هاتۆتە خوارەوە نامێنیتەوە

بەڵام لەبەر ئەوەی یەکێك لەو جێگایانەی ئافرەت حەرامەو ،ئەویتریان حەلاڵ پێویستە ئەو جێگەیە ڕون بکرێتەوە کە دروستە لێوەی خەڵکی بچێتەلای ئافرەت هەر بۆیەخوای گەورە فەرمانی کردووە بەشوێنی کێڵان ،شوێنی کێڵانیش ئەو جێگەیەیە کەمنداڵی لێوە دێتەدەرێ وەئەم جێگەیەیە کە پێویستی پیاوان جێبەجێ دەکات .

وەسەبارەت بەوگێڕانەوەی دراوەتە پاڵ(رضا) ڕەزای خوای لێبێ، لە بارەی حەلاڵی و ڕەوایی چونەلای ئافرەتان لەدواوە ،بەڵگەسازییەکە بەوتەکەی (لوط) علیه السلام. دەڵێم:

ڕاڤەی ئایەتی (يَا قَوْمِ هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ) هود/٧٨

لەئایەتێکی تردا هاتووە کەدەفەرموێت:( وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ) العنكبوت/٢٨.

( لوط کاتێ بە هۆزەکەی وت ئێوە بەڕاستی کاری نێربازی دەکەن ،هیچ یەکێك لەگەلان پێش ئێوە شتی وای نەکردووە ،ئێوە دەچنەلای پیاوان و ڕێگە دەبڕنەوە).

جا ڕێ بڕین واتای چەتەگەرێتی نییە بەتەنها بەڵکو واتای ئەوەش دەگەیەنێت کەبەوکارەیان وەچەو نەوە لەبن دێنن، واتە بەوەی کەدەچن لەدواوە کاری خراپ دەکەن ، بۆیە ئەگەر لەسەر چونەدواوەی (پیاوان وئافرەتان)بەردەوام بن و واز لەوەچە خستنەوە بهێنن ئەوا مرۆڤایەتی لەناودەچێت و نەوەبن بڕدەبێت.

کەواتە ئایەتە پیرۆزەکە ئەم واتایە دەخوازێت بەتایبەتی گەر بڕوانیینە شێوازی باسی ئایەتەکە لەوەی پێش خۆی گومانیش لەوەدانییە کە ئەم جۆرە زانستە

لەلای پێشەوا (رضا) شاراوە نەبووە ، کەواتە دەرکەوت ئەو وتەیەی دراوەتە پاڵ ئیمام (رضا) بوختان وهەڵبەستراوە.

چونەلای ئافرەت لەدواوە جگە لە (شیعە) بەتایبەتیش ئیمامییەکانیان کەسی تر شتی وای بەلاوە ڕەوانییە

بزانە هەمو(سەید) و ئەوانەی لە حەوزەی نە جەف و تەواوی حەوزەکانی ترن هەرهەمویان ئەم کارە قێزەونە دەکەن. هاوڕێیەکمان هەبو بەناوی (سید أحمد الوائلي)دەیوت :لەوکاتەی کە ئەوڕیوایەتانەی بینیوە دەستی کردووە بەوکارە قێزەونەو زۆربەدەگمەن ،دەچووە لای ئافرەت لە پێشەوە.

من بۆخۆم هەرکات بەهەریەکێك لەو (سەید)ەبەڕێزانە لەهەرکوێدا گەیشتبم پرسیاری ئەوەم لێکردون ،کەئایاڕەوایە چونەلای ئافرەت لەدواوە یان نا ؟هەمویان پێیان دەوتم: بەڵێ ڕەوایە ،جائیتر دەستیان دەکرد بە هێنانەوەی ئەو ڕیوایەتانەی لەو بارەوە هەیە ،یەکێك لەوانە ، ئەوگێڕانەوەیە بو کەلە پێشەوە ئاماژەمان پێدا

جانەك بەچونە لای ئافرەت لەدواوە وازیان هێنابێت ،بەڵکو زۆرێك لەوانە چونەلای نێرینە شیان حەلاڵ کردبو،بەتایبەت(مێرد منداڵ).

ڕۆژێکیان لەحەوزە بوین هەواڵ هات کەبەڕێز (سەید عبدالحسین شرف الدین الموسی) ،گەیشتۆتەشاری (بەغداد) ، بەونزیکانەش دەگاتە نەجەف تاچاوی بەبەڕێز (آل کاشف الغطاء) بکەوێ ئەم (سعد شرف الدین)ە، یەکێك بو ،لەهەرە ئەستێرەدیارەکان لەلای زاناو نەخوێندەوارەکانی شیعە بەتایبەت پاش نوسینی چەند کتێبێك وەك کتێبی (المراجعات والنص والاجتهاد).

کاتێ گەیشتە نەجەف سەردانی حەوزەی کرد لەلایەن هەڵسوڕێنەرانی حەوزەوە بەمامۆستاو قوتابییەکانییەوە ،خۆش هاتنێکی گەرمیان لێکرد

جالەدانیـشتنێکدا لـە نوسـینگەی (سـید آل کاشـف الغطـاء) ،کەچـەند بـەرێزو سەیدێکی تریشی لێ بون ، لەگەڵ هەندێك لەقوتابیانی حەوزە کە منیش یـەکێك بـوم لـەو ئامادەبوانـە لەناوگەرمـەی دانیـشتنەکەدا گـەنجێك کەلەسـەرەتای لاوێتیدا بو ، هاتەژورەوەو سلاوی کرد ئامـادەبوانیش سـلاوەکەیان سـەندەوە و گەنجەکە بە (سید آل کاشف العظاء )ی وت: سید پرسیارێکم هەیە ئەویش پێی وت: پرسیارەکەت لەبـەرێز (شـریف الـدین) بکـە (وەك رێزێـك حـەزی کـرد ئـەو وەلام بداتەوە).

گەنجەکە وتی :سید من لە(لندن) دەخوێنم بۆبەدەست هێنانی نامـەی (دکتـۆرا) وەتا ئێستامن خێزانم نییە ، وەئەمەوێ لەوێ ئافرەتێك یارمەتیم بدات ( سەرەتا گەنجەکە ڕاشکاوانە مەبەستە کەی نەدرکاند).

(سید شرف الدین) پێی وت :دەی خێزان بهێنەو خێزانەکەت لەگەڵ خۆت بەرە.

گەنجەکە وتی ئاخر زۆر گرانە ئافرەتێکی ولاتی خۆم لەکوێ لەگەڵمدا بژی ؟

(سـید شـرف الـدین) لەمەبەسـتەکەی گەیـشت پێـی وت: کەوایـە دەتـەوێ ئافرەتێکی بەریتانی بخوازیت ؟

گەنجەکە وتی :بەڵێ ،(سید شرف الدین) پێی وت :ئەمە دروست نییە خواستنی ئافرەتانی گاوروجولەکە حەرامە.

گەنجەکە وتی دەی چی بکەم؟

(شرف الدین) پێی وت :بگەڕێ ئافرەتێکی موسولمان کـە دانیـشتوی ئـەوێ بـێ بیخوازە ،جا عەرەب بێ یاهندی یاهـەر ولاتێکـی تـر بـەو مەرجـەی موسـولمان بێت.

گەنجەکە وتی: زۆرگەڕاوم کەسێکی وام چنگ نەکـەوتووە کەبەشـیاوی ئـەوەی بزانم ببێتە هاوسەرم هەتا ویستم کاری (موتعە) بکەم دەسـتم نەکـەوت ،وەهـیچ

ڕێگەیەکی ترم لەبەردەمدانییە ، یادەبێ زینابکەم یادەبێت ژن بێنم هەردوکارەکەش بۆمن قورسن.

زیناکردن من لێی دورم چونکە حەرامە ،ژن هێنانەکەشم وەك دەزانی بۆم ناکرێت ،من سالێکی ڕەبەق یازیاتر ،لەوێ دەمێنمەوە ،پاشان بۆ پشو مانگێك دەگەڕێمەوە ،ئەمەش خۆت دەزانی سەفەرێکی دورو درێژە ،کەوایە چی بکەم؟

( شرف الدين) کەمێك بێ دەنگ بو[1] پاشان وتی: بەڕاستی حالی تۆ ناخۆشە .......،بەهەرحال لەبیرمە ریوایەتێکم لە ئیمام(جعفر الصادق)ڕەزای خوای لێ بێ خوێندۆتەوە ،کەدەڵێ کابرایەك دێت بۆلای کەزۆر گەرۆك و سەفەر کار دەبێ وباسی ئەوەی بۆدەکات کەناتوانێ خێزانەکەی لەگەل خۆی ببات یا لەوشارەی ئەو بۆی دەچێ ناتوانێ موتعەبکات (وەك تۆ هەمان حالی هەیە) (أبو عبدالله) ڕەزای خوای لێبێت پێی دەڵێ :

( اذا طال بك السفر فعليك بنكح الذكر) ئەگەر لەسەفەر زۆرت پێ چو ،لەگەل نێردا جوت بە ئەمە وەلامی پرسیارەکەتە[2]. گەنجەکە چووە دەرەوەو نیشانەی

---

[1] دیار بوسەرسام بو لەوەلامی گەنجەکە، من بۆخۆم جارێك هەلم بۆرێکەوت بەتەنها ،پرسیاری ئەوەم لە سيد آل كاشف العظاء کرد ،لەبارەی ئەو ریوایەتەی کەسيد شرف الدين باسی کرد ،آل كاشف ،،پێی وتم: من ئەو ریوایەتەم نەبینیوە ،ئیتر من لەو کاتەوە هەولم دا سەرچاوەی ئەو ریوایەتەبدۆزمەوە ،،لەهەرچ شتێك کەدەم خوێندەوەو هەرسەرچاوەیەکم چنگ بکەوتایە ، بەلام هیچ سەرچاوەیەکی ئەوریوایەتەم دەست نەکەوت ، من وای بۆدەچم کەشرف الدين ئەوریوایەتەی لەخۆیەوە وتبێ ،تالەبەرئامادەبواندا هەست بەشەرمەزاری نەکات.

[2] هەندێك لە قوتابییەکانی شرف الدين ،پێیان وتم:کە(شرف الدين) لە ئەوروپازۆر لەگەل ئافرەتی ئەوروپی ڕادەبوێرێ ،بەتایبەت کچە جوانەکانیان ،هەموڕۆژێك یەکێك لەو ئافرەتانە بەکرێ دەگرێ ولەگەلێدا ڕادەبوێرێ :(شرف الدين) خۆی ئافر

سەرسامی لەوەلامەکەیدا بەدەموچاویەوە دیار بو ،بەلام ئامادەبوان لەوانەش سەرۆکی حەوزە کەسیان ورتەیان لەدەم نەهات

جارێکیان یەکێك لەو بەڕێزانە ی لەحەوزەبون بەسەر مێرد منداڵێکەوە کەلەحەوزە دەیخوێند گیرا هەواڵەکە زۆرێك بیستی بۆ رۆژی دوایی ئەم بەڕێزەلەڕاپەوەکەدا پیاسەی دەکرد سەیدێکی تر لێی نزیك بۆوە کەیەکێك بو لەمامۆستاکانی حەوزەو هەواڵەکەی بیست بو ،بەگاڵتەوە پێی وت :(سید ماتقول فی ضرب الحلق ) سید لەبارەی کێشان بە هەلەقەی قنگ چی دەڵی ؟ئەویش زۆر بە گاڵتەیەکی تەواوەوە پێی وت:(یستحسن ادخال الحشفة فقط) واباشە تەنها سەری کێری بۆبخەیتەناوەوە، ئیتر هەردوکیان دایانە قاقای پێکەنین؟؟!!!

سەیدێکی تر لەوێ هەیە ،کەیەکێکە لەمامۆستاکانی حەوزەو بەنێر بازی بەناو بانگە رۆژێك منداڵێك دەبینێ لەگەڵ یەکێك لە مامۆستاکانی حەوزەدا دەبێ، لێی ئەپرسێ ئەم منداڵە چی یە لەگەڵتا؟پێی دەڵێ کورمە، فلان کەس، ئەویش پێی دەڵێ:بۆناینێری بۆلامان تا وانەی پێ بڵێین فێری بکەین وەك خۆت لەدوایدا زانا دەرچێ؟

ئەویش بەگاڵتە پێکردنەوە وەلامی دەداتەوە پێی دەڵێ : ئەی خوێڕی ،هیچ وپوچ ئەتەوێت بیهێنم بۆلات تا(واو وای) لێ بکەی؟

---

هتێکی گەنجی مەسیحی سەر بە مارۆنییەکان ،ژنییەتی ،بەناوی (نەهار)، دەی چۆن بۆخۆ ی حەلاڵ بێ ئافرەتی گاور بێنێ و لە سەرخەڵکی تر حەرامی دەکات؟

ئـەم بەسـەر هاتـە یـەكێك لـە مامۆسـتاكانی حـەوزە ،كـەجێی متمانەیـە بـۆی گێڕامەوە١ لـەم ڕوداوانـەمان زۆربینیـوە ،ئەوەشـی كەبیـستومانە زۆر زۆر لـەوە زیاترە ؛ (سید عبـاس) هـاوڕێ ی بـەڕێزمان شـت گـەلێكی زۆری لـەم ڕوداوانـە كۆكردۆتەوە ،بەدرێـژیو بەمێـژوی كاتەكانیـشیانەوە تۆمـاری كـردون و نـاوی كەسەكانیـشی تێدایـە و نیـازی وایـە بیكـات بـەكتێبێك ،ئـەی ویـست نـاوی كتێبەكـەی بنـێ ( فـضائح الحـوزة العلميـة فـی النجـف ) چـونكە بەڕاسـتی زۆر پێویستە ڕاستییەكان بۆ خەڵكە نەخوێندەوارەكانی شیعە ،باسبكرێت و ئاگـادار بكرێنـەوە ؛ ئـەو خەڵكـە هـەژارو داماوانـەی كـەنازانن ،چـی لەپـشتی پـەردەوە ڕودەدات ؛ نـازانن بـەناو زانـاو سـەیدەكان خـەریكی چـین كەسـی وایـان هەیـە هاوسەری یاكچی یا خوشكی دەنێرێ بە مەبەستی سەردانی شوێنە پیرۆزەكان ؛ یا بەنیازی منداڵ ، یا بە مەبەستی پێشكەش كردن بـۆ (حـسین) بـەڵام یـەكێك لەو سەیدانە وەریدەگرێت ،بەتایبەت ئەگەر ئافرەتەكە جوان بێـت ؛ دەیـانهێنن لەگەڵ خۆیاندا و، هەرچی خراپەیە لەگەڵیاندا دەیكەن ،لاحول ولا قوة الا بالله.

## پێنج یەك (الخُمس):

خومس (پێنجیەك)یەكێكی ترە لـەو بابەتانـەی كەلەلایـەن فوقـەها و زاناكانـەوە بەشێوەیەكی یەكجار خراپ بەكاردێت بۆتە سەرچاوەیەكی ئـەوتۆ كەسـەیدەكان وزاناكان لەو ڕێگەیەوە سامان ودارایيـەكی بـێ شـوماریان چـنگ بكـەوێ لەگـەڵ ئـەوەی كەدەقـەكانی شـەرع بەڵگـەن لەسـەرئەوەی كەڕەشـە خەڵكـە شیعەكە دەتوانن وەك تـەواوی مـاڵ ودەسـكەوتەكانی تریـان خـەرجی بكـەن و مامەڵـەی

[1] هیچ جێگەی سەرسامی نەبێ ، چونكە هەندێك لەوكتێبانەی وەختی خۆی دەمان خوێندەوە بەدەق ،باس لەم كارانە دەكات وەك دەڵێ(وجائز نكاح الغلام الامرد.... )دروستە مێردمنداڵ مارەبكرێ

لەگەڵدابکەن بەڵکو ئەوەی پێنج یەك دەدات بەوسەیدوزانایانە بەتاوانباریش دادەنرێت چونکەسەرپێچی ئەودەقانەی کردووە کە لەپێشەوای بڕوەپداران و پێشەوایانی ئەهلی بەیتەوە هاتوە (سڵاوی خوایان لێبێت) ، جابۆئەوەی خوێنەری ژیرو وریا لەراستی پێنج یەك وشێوەو چۆنێتی سەرفکرنی ،ئاگاداربێ ئێمە باسی پێنج یەك دەخەینەڕو وەئەوپێشکەوتنە مێژوییەی ڕوی دا تیایدا،بەبەڵگەی شەرع و وتەو فەتوای ئەوزانایانەی کەجێگەی متمانەو بایەخن و بایەخ بۆقسەکانیان دادەنرێ :

١-(ضریس الکنانی) دەڵێ:(أبوعبدالله) ڕەزای خوای لێبێ پێی وتم: ئەزانی خەڵکی لەکوێ وە توشی زینا بون وزینا چوە نێویانەوە؟وتم: نەخێر بەفیدات بم ،وتی :لەڕێگەی ئەو پێنج یەکەی ئێمەی ئەهلی بەیتەوە تەنها ئەو لایەنگرو کۆمەڵەپاکەی ئێمەنەبن ئەمانە پێنج یەکیان بۆ حەلاڵە بۆ پێویستی لەدایك بونیان. أصول الکافی ٥٠٢/٢ بەشەرحی شێخ مصطفی

٢-(حکیم مؤذن بن عیسی) ،دەڵێ لەبارەی ئەم ئایەتەی کەدەفەرموێ(وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ للّه خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى..........) ا لانفال /٤١

بزانن هەرچیتان دەست کەوت ئەوا پێنج یەکی هی خواو پێغەمبەرو خزمە نزیکەکانە،پرسیارم لە(أبو عبدالله) کرد جا (أبو عبد الله) ئانیشکەکانی خستە سەر ڕانەکانی خۆی و بەدەستی ئاماژەی کردو وتی:سوێند بەخوا ئەم پێنج یەکە بەخشینی ڕۆژێکە بە ڕۆژێك بەلآم ئەوە هەیە کەباوکم لایەنگرانی خۆی گەردنی ئازاد کردون و لێ یان ناسەنێ ،تابەڵکو ئەوانیش زەکات بدەن) أصول الکافی ٤٩٩/٢

٣-(عمربن یزید)،دەڵێ :(موسوڵمانێکم بینی لەمەدینە ،کەماڵێکی هێنابو بۆلای (أبو عبدالله) ئەوساڵە ئەویش لێی وەرنەگرت و ڕەتی کردەوە .......،وەپێی وت:ئەی (أبوسیار) ئێمەگەردنی تۆمان ئازادکرد و ئەوماڵەحەلاڵی خۆت بێ و بیخەرەلای ماڵ وداراییەکانی ترت ،وەهەرشتێکیش کەبەدەستی لایەنگرانمانەوەیە لەزەوی گەردنیان ئازاد بێت تاسەرپەرشتی ئێمە هەڵدەستێ ) هەمان سەرچاوە٢/٢٦٨

٤- (محمد بن مسلم) لەیەکێك لە ئال وبەیتەوە دەگێڕێتەوە کەوتویەتی :( ناڕەحەترین شتێ کەخەڵکی تێدابێت لەڕۆژی دوایدا ئەوەیە کە خاوەنی پێنج یەك هەڵدەستێ ودەڵێ، ئەی پەروەردگار پێنج یەکەکەم، وەئەوەئێمەش گەردنی لایەنگرانی خۆمانمان لەم پێنج یەکە ئازادکرد تالەدایك بونەکانیان پاك بێت) أصول الکافی ٢/٥٠٢

٥-(أبوعبدالله )ڕەزای خوای لێبێت ،دەڵێ:( خەڵکی هەرهەمویان لەژێرسایەو سێبەری ئێمەدادەژین ئەوە ئێمەش لایەنگران و دۆستانی خۆمانمان لە پێنجیەك ئازادکرد) من لایحضره الفقیه ٢/٢٤٣.

٦-(یونس بن یعقوب)،دەڵێ: لەلای (أبوعبدالله) بوم ڕەزای خوای لێبێ پیاوێك لە (قەناطین)ەکان هات بۆلای پێ ی وت :بەفیدات بم ئێمە ماڵ وقازانجی باشمان دەست دەکەوێ وەدەشزانین کەمافی ئێوەمان لەسەرە، وەئێمە لەمبارەوە کەمتەرخەمین ،(أبوعبدالله) ڕەزای خوای لێبێ دەڵێ:بەڕاستی ئێمەچاك ناکەین ئەگەرماڵ ودارایتان لەسەر دابنێین من لایحضره الفقیه ٢/٢٣.

٧-(علی بن مهزیار) دەڵێ: لەکتێبێکی (أبوجعفر) ڕەزای خوای لێبێ خوێندومەتەوە کەپیاوێك هات داوای ئەوەی لێکرد کەلەخواردن

وخواردنەوەکەیدا لەپێنج یەك بیبەخشێ ئەویش بەدەستی خۆی ئەمەی بۆ نوسی :(کەسێ لەمافی من کەم بکاتەوە ،گەردنی ئازاد بێت وبۆی ڕەوایە). من لایحضره الفقیه ٢٣/٢

٨- پیاوێك هات بۆلای پێشەوای باوەڕداران ڕەزای خوای لێبێت وتی(ماڵێکم دەست کەوت بە خراپە بەکارم هێنا ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم ؟ ئەویش پێی وت: بچۆ پێنج یەکەکەم بۆ بهێنە ، چو هێنای پاشان پێی وت : ئەم پێنجە بۆخۆت چونکە ئەگەر هەر کەسێك تەوبەی کرد ،ماڵەکەشی لەگەڵ خۆیدا تەوبە دەکات ). هەمان سەرچاوە ٢٢/٢

ئەم ڕیوایەتەو چەندانی تر بەڕاشکاوی باس لەوە دەکەن کەشیعەدەتوانن پێنج یەك نەدەن بۆیەهەرکەسێ ویستی بۆخۆی بیخوات و نەیدات بەئەهلی بەیت ئەوا بۆی ڕەوایە و هیچ تاوانی ناگاتێ بەڵکو پێویستە هەروەك لە ڕیوایەتی سێ هەمدا هاتووە ،پێنج یەك بدات بەو پێشەوایەی کەلە ئاخیر زەماندا دێت وسەر هەڵدەدات . وەئەگەر پێشەوا بونی هەبێت ئەوا پێنج یەکی نادرێتێ ،تا ئەوکەسەی لەئاخرزەماندا دێت ،لەئال وبەیت ، ئیتر چۆن ڕەوایە بدرێت بەزاناو موجتەهیدەکان ؟ فەتوای زانا متمانە پێکراوەکان لەبارەی نەدانی پێنج یەك لەسەر شیعە پشت بەستووە بەو دەقانەی کەلە پێشەوە باسمان کردو چەندین دەقی تر گەلێ زۆرن بەڕاشکاوانە شیعە عەفو کراوە لەدانی پێنج یەك وە ئەم فتوایەش لەوزانایانەوە دەرچووە کە لە گەورەی زاناو موجتەهیدەکانن لەوانەی کەتوانای زانستی و پلەی بەرزیان هەیە لەنێو زانایاندا لەوزانایانەی کەفتوای ئەوەی داوە کەڕەوایە پێنج یەك نەدرێت بە هیچ کەسێك

١- (نجم الدين جعفر بن الحسن) ، کەناسراوە بە (المحقق الحلی) و ساڵی ٦٧٦ك مردووە دوپاتی کردۆتەوە کە ڕەوایە لە کاتی نەبونی ئیمامی مونتەضیر "کەلە ئاخر زەمانداپەیدا دەبێ" سود لەدارایی وەربگیرێ و بەدەق دەڵێ:( پێویست نییە ئەوانەی پێنج یەکیان لەسەرە پشکی لێ بدەن ). بڕوانە:کتاب شرائع الاسلام ١٨٢-١٨٣،کتاب الخمس

٢-(يحی بن سعد الحلی) ، ساڵی ٦٩٠ك مردووە

وای بۆچووە کە پێنج یەك و غەیری پێنج یەکیش حەلاڵ وڕەوایە بۆشیعە ئەمەش وەك ڕێز وبەخششێك لەپێشەواکانەوە بۆ شیعە وەك لەو کتێبەدا(الجامع الشرائع ص١٥١)دا هاتووە

٣-( الحسن بن المطهر الحلی) کەلەسەدەی هەشت دا ژیاوە فتوای داوە کە پێنج یەك ڕەوایە بۆ شیعە و دەتوانن نەیدەن وەك لە کتێبی (تحرير الاحکام: ٧٥)دا هاتووە.

٤-( الشهد الثانی) کە لە ٩٦٦ ك وەفاتی کردووە لە کتێبی (مجمع الفائدة والبرهان :٤ /٣٥٥-٣٥٨)بەشێوەیەکی ڕەها بۆ ئەوە چووە کە پێنج یەك ڕەوایە، دەڵێ : ئەوەی ڕاستر بێت پێنج یەك ڕەوایە وەك لەکتێبی ( مسالك الأفهام :٦٨)دا هاتووە

٥- (المقدس الأردبيلی) ، ساڵی ٩٩٣ ك مردووە ، زاناترین زانای چاخی خۆی بووە بەجۆرێك کە لەقەبی (المقدس)یان لێ ناوە ،فەتوای حەلاڵی پێنج یەکی داوە و شیعە دەتوانێ بەڕەهایی مامەڵە و هەڵسوکەوت بە ماڵی نادیارەوە[1] بکات بەتایبەت ئەگەر پێویستی پێی بو وەدەڵێ بەگشتی هەواڵەکان ئەوە

---

[1] مەبەست لەماڵی نادیار ئەو ماڵەیە کە دەبێت بدرێ بە"مهدی" کەلە ئاخر زەماندا پەیدا دەبێت ،کە پێشی دەوترێت :(خُمس).

دەگەیەنن ،کەپێنج یەك لەسەر خەڵکی لادەچێت کاتێ کە پێشەوا (مەهدی ) دیار نەبو ، هەروەها کاتێکیش کەپەیدابو بەو واتایەی کەواجب و پێویست ناکات لەکاتی پەیدابونیشی دا پێنج یەك بدرێت لەبەر نەبونی بەڵگەیەکی بەهێز لەسەر قازانج ودەست کەوتی خەڵکی ونەبونی دەست کەوتی جەنگ .

دەڵێم :ئەم فتوایەی لەو ئایەتەوە وەرگرتووە کەدەفەرموێ (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ) الأنفال /٤١ پاشان چەند ریوایەتێك دەهێنێ لە پێشەوا"مهدی"وە کە دەڵێ ئێمە پێنج یەکمان بۆ شیعە ڕەوا داوە.

٦-(العلامة سلار) دەڵێ :پێشەواکان پێنج یەکیان بۆ شیعە ڕەواداوە لەسەردەمی نادیاری "مهدی"دا ئەمەش وەك ڕێزو بەخششێك تایبەتە بە شیعەوە بڕوانە/ کتاب المراسم ٦٣٢.

٧-( سید محمد طبا طبائی) ، لەسەرەتای سەدەی یازدەوە مردووە دەڵێ:ئەوەی ڕاستر بێت ئەوەیە کە پێنج یەك ڕەوایە مدارك الأفهام :٣٤٤.

٨-(محمد باقر سبزاوی) کەلەکۆتایی سەدەی (یازدە)دا مردووە ،لەپاش گێڕانەوەی چەند زانایەك کە هەمویان فتوایان داوە کە پێنج یەك ڕەوایە بۆ شیعە دێتە سەر وەلاّم دانەوەی هەندێك کێشە کە بەرەو ڕوی ئەم بۆچونە دەبێتەوە ودەڵێ: ئەو هەواڵ وگێڕانەوانەی باس لەڕەوایەتی پێنج یەك دەکەن ،ڕاسترو ڕاشکاوانە ترن هیچ پاساوێك نییە بۆلادان لێی ،لەبەر ئەم گێڕانەوانەی کە باس کران

بەگشتی ڕەوایەتی پێنج یەك لەسەردەمی نادیاری "مەهدی"دا بۆچونێکی بەهێزە بڕوانە:کتاب ذخیرة المعاد :٢٩٢.

٩- (محمد حسن القیض الکاشانی)، لەکتێبەکەیدا (مفتاح الشریعة) ص٢٢٩،مفتاح ژمارە "٢٦٠" ئەو بۆچونەی بەلاوە هەڵبژاردەیە کە دەڵێ: ئەو

بەشەی تایبەتە بە (مەهدی) کە پێنج یەکە، لەسەر شیعە لاچوو ،وە دەڵێ: چونکە پێشەوایان ئەمەیان بۆ شیعە بەڕەوا داناوە

١٠- (جعفر كاشف الغطاء)، کە ساڵی ١٢٢٧ك مردووە ، لە (كشف الغطاء) ص٣٦٤: باس لەوە دەکات کە پێشەوایان پێنج یەکیان بەڕەوا داناوە و پێویست نییە بدرێت پێیان.

١١-(محمد حسن النجفى) ،ساڵی ١٢٦٦ك مردووە ،لە جواهر الكلام ،ص١٤١ ج ١٦ باس لەوەدەکات کە پێنج یەك بۆ شیعە ڕەوایە لەسەردەمی نادیاری (مهدی) ،بەڵکو هەتا لەسەردەمی پەیدابونیشیدا کەوەك نادیار وایە، وە ئەو گێڕانەوانە دەهێنێ کە زۆر نزیکە بگاتە ، پلەی ((تەواتور)).

١٢- (شيخ رضا الهمدانى) ،ساڵی (١٣١٠ك) مردووە ، لەکتێبەکەیدا "مصباح الفقيه"ص ١٥٥: لەکاتی نادیاری (مهدی) دا پێنج یەکی بەڕەواداناوە ،وەشێخ (همدانى) زۆر لەدواتر بووە نزیکەی پێش سەدەیەك یازیاتر دەبێ..

بەم جۆرە بینیمان کە پێنج یەك بۆ شیعە ڕەوایەو گەرنەیدەن عەفوکراون لێی ،ئەمەش بۆچونێکی بڵاوە لەلای هەموزانا پێشینەکانی شیعە و ئەوانەی دواتریش ،وەبەم جۆرە کاری لەسەرکراوە تا سەرەتاکانی سەدەی ١٤ ، ئەمە جگەلەوەی کەچەندین دەق لەبارەی ڕەوایەتییەوە هاتووە ئیتر گەروابێ چۆن ڕەوایە پێنج یەك بدرێت بە پێشەواو موجتە هیدەکان ؟لەگەڵ ئەوەی پێشەوایان (سلاویان لەسەر) پێنج یەکیان ڕەت کردۆتەوە ، گەڕاندویانەتەوە بۆ خاوەنەکانیان و ،بەخشیویانن لە دانی، جا ئایا زاناو موجتە هیدەکان چاکترن لە پێشەواکان ،سلاویان لەسەر؟

فەتوای ڕەوایی پێنج یەك بۆشیعە ، تەنها ئەو کەسانەی کە باسمان کردن ، فەتوایان نەداوە لەسەری وبەس ،بەڵکو چەندان قات وئەوەندەی تری

ئەوژمارەیە ، بەدرێژای چاخەکان فتوایان لەسەرداوە بەڵام ئێمە لە هەرچاخە فەتوای زانایەکمان هەڵبژارد ، تا بۆمان ڕون بێتەوە کەدانی پێنج یەك واجب نییە،ئەمەش قسەو وتەی زۆرێك لەشارەزایانە ، بەدرێژایی سەردەم چونکە ئەمە وتەی پەسەندە ، لەم بابەتەوە یەکان گیرە لەگەڵ دەقەکان و کاری پێشەوایان ،سلاویان لەسەر

بائێستاش فتوای دو کەڵە زانای ڕێبازی (شیعە) وەربگرین کە ئەوانیش: ١- شێخ المفید ٢- شێخ الطوسی یە.

١-(شیخ المفید) ،دەڵێ(هەندێ لەزانایانمان ڕاجیاییان هەیە لە پێنج یەك دا ، لەکاتی دیار نەبونی (مهدی) دا،وەهەریەکێك لەو دەستەوکەسانە چەند قسەیەکیان کردووە (پاشان ئەندازەی وتەکان باس دەکات)یەکێك لەوانە ئەوەیە کەهەندێك لەوانە نەدانی پێنج یەکیان لابردووە لەبەرنادیاری (امام مهدی) هەندێکی تر بە پێویستیان داناوە کەئەم ماڵە بشاردرێتەوە، وە ئەو هەواڵەش تأویل دەکەن کەدەڵێ:(زەوی لەکاتی بەدەرکەوتنی (امام) دا شتەکانی نێوی دەردەخات کاتێکیش کە امام (مهدی) هات خواجێگەی ئەو شتە شاراوانەی پێ نیشان دەداو، لەهەمو جێگەیەك هەڵیان دەگرێتەوە)پاشان دواتر بۆچونێك هەڵدەبژێرێ و دەڵێ: پێنج یەك واز لێدەهێنرێت بۆ (مهدی) ئەگەر خاوەن سامانەکە ترسی هەبو پیاڕانەگا ،لەپێش مردنیدا وەسێت بکات بۆکەسێك کە متمانەی بەژیری ودینی هە بێت تائەویش دەیگەیەنێتە دەستی ئیمام (مهدی)

گەرئەوکەسە گەیشتە ئەوسەردەمە گەرنا ئەوە وەسێت دەکات بۆکەسێکی تر کەجێگەی متمانە بێت ئیتر بەم جۆرە تا ئیمام دەردەکەوێت ،وەدەڵێت من ئەم

بۆچونەم بەلاوە ڕونترە وەك لەتەواوی بۆچونەکانی تر ،چونکە پێنج یەك مافی کەسێکی نادیارە کەپێش دیارنەمانی هیچ ڕێگەیەکی دانەناوە کە پێویست بێت.

پاشان دەڵێ :وەمامەڵەی ئەو سامانە وەك سامانی زەکات مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت ،کەواتە: لەم کاتەدا لەسەری لاناچێت، وە دەڵێ:خۆئەگەر کەسێکیش بێت پێنج یەك کەتایبەتی ئیمامە بکات بەدوبەش ،بەشێکی بۆ ئیمام وبەشەکەی تری بۆ هەتیوانی کەس وکاری محمد و ڕێبواران و هەژاران بەوجۆرەی لە قورئاندا هاتووە

گەرکەسێك ئەمەی کردئەوا لەڕاستی دورنەکەوتۆتەوە بەڵکو پێکاوییەتی بڕوانە / المقنعة ص٤٦

٢-(شیخ الطوسی) کەساڵی ٤٦٠ك مردووە دامەزرێنەری (حەوزەی نەجەف)ەو یەکەم پێشەوای ئەوقوتابخانەیە بووە ،لەپاش باسکردنی حوکمەکانی پێنجیەك ،دەڵێ :ئەمە کاتێك وایە کە ئیمام (مهدی) بەدیار بکەوێت ،پاشان دەڵێ: لەکاتی نادیاری ئیمام دا ئەو پێشەوایانە ڕوخسەتیان داوە بۆلایەنگرانی خۆیان کەلەمافی خۆیاندا سەرفی بکەن وەك ژن وژن خوازی و بازرگانی و ماڵ و خانو.

ئیترجگەلەمەبەهیچ جۆرێك نابێت تەسەڕوفی پێوە بکرێت،وەئەوەشی کەلە پێنج یەك شاردراوەتەوە و غەیری ئەمەش لەکاتی نادیاری ئیمام دا ئەوەزانایانمان ڕاجیاییان تێداهەیە وە هیچ دەقێکی دیاری کراونییە لەم

،ارەوە[1] تەنهانەوەندە هەیە هەریەك لەزاناكانی شیعە وتەیەكی وتووە ،كە ئیحتیاتی تیادا ڕەچاوكردووە پاشان (الطوسی)ئەم چوار وتەیە باس دەكات:

١-هەندێك لەزانایان وتویانە لەكاتی نادیاری ئیمام دا پێنجیەك وەك ئەو شتانەی كە بۆمەسرەفی ژن وژن خوازی و بازرگانی مامەڵەی پێوەدەكرێت ئەویش هەروایە ئەمە لە هەمو بۆچونەكان ڕاسترە چونكە یەكدەگرێتەوە،لەگەڵ ئەو دەقانەی كەلە پێشەواكانەوە هاتووە ، زۆرێك لەزانایانیش لەسەر ئەم بۆچونەن.

٢-هەندێكی تر دەڵێن: دەبێت ئەو پێنج یەكە بپارێزرێت مادەم ئەو كەسە لەژیاندا بێت كاتێكش كە كاتی سەرەمەرگی هات ،دەبێت وەسیەت بكات بۆیەكێك لەبرا موسوڵمانەكانی لەوانەی كە متمانەیان هەیە تا ئەویش بیگەیەنێتە دەستی كەسێكی تر گەرئەویش كە گەیشتە سەرەمەرگ ئیتر بەم جۆرە تا دەگاتە دەستی ئیمام (مهدی).

٣- هەندێكی تر دەڵێن: دەبێت لەژێر زەویدا بشارێتەوە ،چونكە كاتێك كە ئیمام بەدیار دەكەوێت زەویش ئەوشتانەی ناوی دەردەداتە دەرەوە.

٤- هەندێكی تردەڵێن: پێنج یەك دەبێت بكرێت بە شەش بەشەوە سێ بەشیان بۆ ئیمام ،ئەمە لەژێر زەویدا دەشاردرێتەوە یادەدرێتە دەست كەسێكی متمانە پێكراو وە ئەم بۆچونەش بەلای (الطوسی)یەوە بۆچونێكی هەڵبژاردەیە

[1] ئەم قسەیەوانییە ،چونكە لەپێشەوە،چەندین دەقمان هێنا كەلەكاتی نادیاری ئیمامدا ،دەتوانرێ تەسەڕوف بە پێنج یەكەوە بكرێ.

سێ بەشەکەی تریش بەسەر خاوەن مافەکانلا دابەش دەکرێت لەهەتیوەکانی بنەماڵەی محمد صلی الله علیە وسلم و هەژارەکانیان ورێبوارەکانیانەوە ئەمە دەبێت کاری پێ بکرێت ، ئەم بۆچونەش لەگەڵ بۆچونەکەی (المفید)دا یەکدەگرێتەوە.

پاشان دەڵێ:(خۆئەگەرهاتو کەسێ ،احطیاطی کردو کاری بەیەکێك لەو بۆچونانە کرد کەباسمان کردن تاوانبار نابێت )

(شیخ الطوسی) مامەڵەکردنی بەپێنج یەکەوە کورت کردۆتەوە لەم چوارخاڵەی سەرەوەدا لەکاتێکدائەگەر ئیمام نادیاربو لەناو ئەم چواربۆچونەشدا بۆچونی چوارەمی هەڵبژاردوە [1] لەکاتێکدا گەرکەسێ هەریەك لەم بۆچونانە هەڵبژێرێ وکاری پێ بکا تاوانبار نابێت.

گەرسەرنج لەم چواربۆچونە بدەین دەبینین ئەگەرچی لە تەفاصیلدا ،جیاوازیان لەنێواندا هەیە ،بەڵام هەمویان لەیەك شتدا کۆکن ئەویش ئەوشتەیە کە ئێمە دەمانەوێت ڕونی بکەینەوە کەبریتیە لەوەی ئەوماڵ وداراییانەی واتە(پێنج یەك)کەمافی ئیمامی نادیارە یاکەسێکی تر بەهیچ جۆرێك بۆ(سەید)و (موجتەهید)ەکان نییە دەستی تێ وەربدەن وهەڵسوکەوتی پێوە بکەن لەگەڵ ئەوەی ئەو چواربۆچونەی سەرەوە جیاوازن لە شێوەی سەرفکردنی پێنج یەکدا ،بەڵام بەهیچ جۆرێك تەنانەت ئاماژەیەکیشی تێدانییە بەڕەوایی ج جای واجب بون ،بەوەی کەپێنج یەك یابەشێکی بدرێ بەسەیدو موجتە هیدەکان

---

[1] ئەمەش بۆچونی زۆرینەی زانایانە.

بۆچونی چوارەم ئەوەی کە (طوسي) هەڵیبژاردووە ئەوەیە کە شیعەکان لەسەری دەڕۆن (الطوسي)ش وەك ئاشکرایە یەکێکە لەدامەزرێنەرانی حەوزەی عیلمی و مامۆستای ئەو دەستەیەشە.

جاسەیرە تۆبڵێی (طوسي) وجەماوەری شیعەکان لەسەردەمی ئەودا ولە پێش ولە دوای ئەویش هەڵە بوبن؟ئەمەفتوای یەکەم پێشەوای حەوزەی عیلمی نەجەفە.

ئێستا بابێین فتوای پێشەوایەکی تری حەوزە ،باس بکەین ئەویش دۆست و پێشەوای کۆچکردو (أبوقاسم الخوئی)یە تافتوای یەکەم پێشەوای حەوزەو ،پێشەوایەکی تریون بکەینەوە.

پێشەوا (خوئی):لەباسی پێنج یەك وپێ شیاوان وسەرف کردنیدا دەڵێ :(پێنج یەك لەسەردەمی ئێمەو سەردەمی نادیاری پێشەوا دەکرێت بەدوبەشەوە نیوەی بۆ پێشەوای سەردەم وچاوەڕوانکراو (خوازویەدیاری خات)وگیانمان فیدای ئەو بێت مەبەست ئیمام (مهدی المنتظر)ە نیوەکەی تریشی بۆ { بنی هاشم }و هەتیوو هەژارەکانیان و ڕێبواران .........،تا دەگاتە ئەوەی دەڵێت ئەو نیوەیەی کە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمام(باشترین سلاو بۆسەرخۆی و باوباپیرانی بێت)لەکاتی نادیاریدا دەگەڕێتەوە بۆ جێگرەکەی کە بریتیە لەو کەسەی کەشارەزاو متمانە دارە ،کەشارەزایە لەسەرفکردنی ئەو ماڵەدا جیابۆی دەبرێت یا مۆڵەتی لێ وەردەگیرێت لەسەرف کردنیدا.......تاد) ضیاء الصالحین مسألة ١٢٥٩ ص٣٤٧.

فتواکەی (خوئی)لە فتواکەی (طوسی)جیاوازترە چونکە طوسی بەهیچ جۆرێك باس لەوە ناکات کە پێنج یەك یابەشێك لە پێنج یەك بدرێت بە فەقیهو موجتەهید،وەجەماوەری شیعەکانی سەردەمی خۆشی کاریان بەم فتوایەکردووە بەڵام دەبینین فتواکەی (خوئی) بەدەق باس لەوە دەکات کە پێنج یەك یا بەشێکی دەدرێت بەفەقیهو موجتەهید.

## پوختەی بەرەو پێش چونی تێڕوانینی پێنج یەك

بۆچونی یەکەم: لەپاش بچڕاندنی زنجیرەی پێشەوایەتی و نادیاری پێشەوا (مەهدی) ئەوەیە کە پێنج یەك مافی پێشەوای نادیارە واتە مافی ئیمام (مهدی)یە ،وەهیچ فەقیهو سەیدو موجتەهیدێك مافیان پێوەی نییە هەربۆیە زیاد لە ٢٠کەس بانگەشەی ئەوەیان کرد کەئەمانە جێگری پێشەوای نادیارن لەبەرخاتری ئەوەی پێنج یەك ببەن وە دەڵێن ئێمە لەپێشەوای نادیارەوە ئامۆژگاری وەردەگرین و دەتوانین پێنجیەکی ئەودەست کەوتەی کە پەیدای دەکەین بیدەینە پێشەوای نادیارئەم بۆچونە لەسەردەمی ئەوەی کەپێی دەوترێت "سەردەمی دیارنەمانی بچوك"وابو،وەبەمجۆرەمایەوە تاسەدەیەك یادوسەدە بەهیچ جۆرێك پێنج یەك نەدەدرا بەسەیدو موجتەهیدەکان،لەم ماوەدا چوارکتێب بڵاو بویەوە کەناسراون بەچوار کتێبەڕاستەکەی یەکەم (الصحاح الاربعه الاولی)،هەرچوارکتێبەکەلەپێشەوایانەوە ئەوە باس دەکات کە شیعەکان لە پێنج یەك عەفوکراون و ،بۆیان هەیە هەرچییەکی لێ بکەن ،لەوێدا هیچ فەتوایەك نەبو کەباس لەوەبکات کەدەبێ پێنج یەك بدرێت بەسەیدو موجتەهیدەکان.

بۆچـونی دووەم: پاشـان ئـەم کـارە بـەرەو پێـشەوە چـونی بـەخۆوە بینـی و فەتوادرا بەواجب بـونی دەرکردنـی پێـنج یـەك ،جابۆ دەریـاز بـون لـە بۆچـونی یەکەم ئەم دەستەیە هات فەتوای دا بـەوجۆرەی کـە پێنجیـەك دەربکـرێ بـەلاّم لەژێرزەویدا بشاردرێتەوە تائیمام( مهدی) بەدیاردەکەوێت.

بۆچونی سێ یەم: لەپاش ئەوبۆچونە، پێشەوە چـونێکی تـری بـەخۆوە بـینی و ،فتـوا درا کـەپێنج یـەك بـدرێ بـەلاّم لـەلای متمانـە پێکراوێـك دابنـرێ باشـترین کەسانێکیش بۆ ئەم کارە فوقـەهاو شـارەزایانی مەزهـەب بـون واتـە (مەزهـەبی شیعە)، بەلاّم ئەمە نەك بەواجبی ،بەڵکو باش وایە لەلای ئەوکەسـانە دابنرێـت و فوقەهاو شارەزاکە بـۆی نـەبێ مامەڵـەو هەڵسوکەوت بـەو ماڵـەوە بکـات بـەڵکو دەبێت بیپارێزێت تادەگەیەنرێتە ئیمام (مەهدی)

تێبینیەکی گرنگ:

ئەو فوقەهایە کێ یە کەئەگەر ئەو فوقەها یەی یەکەم مرد ئەو جێ ی بگرێتـەوە و ،ئەوماڵەی کەخەڵکی لای داناوە ،ئەم سەرپەرشتی بکات و بیپارێزێـت لـەدوای ئەو فوقەهایە ؟

گومان لەمەدانییە کەوەلاّمی ڕاست ئەوەیە کە هیچ کەسێکی وانابێـت و وەنـەش بیستراوە یانە خوێندراوەتەوەو بەرچـاوو گـوێ نەکـەوتووە ،کەئەگـەر کەسـێکی وامردو پێنج یەکی لەلابوبێت، وچـوبێتە لای فـەقیهێکی تـر ئـەوەی ڕاسـت بێـت ئەوەیە کـەس وکـاری ئـەو فەقیهـە وەك میراتـی ئـەو ماڵـەی خـەڵك لای دانـاوە دەیبەن بۆ خۆیان و لەنێو خۆیاندا بەشی دەکەن گوایە ئەمـە میراتـی باوکیانـەو بۆیـان بـەجێ مـاوە ،ئەوکاتـە ئـەو پێـنج یەکـەی لای ئـەم فەقیهـە دانـراوە

ئەچێتەگیرفانی وەرەسەکەوە،ئەمە ئەگەر فەقیهەکە کەسێکی متمانە دار بێت و ماڵەکەی لەوەوپێش نەخواردبێ .ئەوەی شایەنی باس بێت یەکەم کەس دانانی پێنج یەکی لەلای فەقیهێك بەواجب دانا ،(ابن بهراج) یا (ابن براج) بو کەبەواجبی دەبێت ئەو پێنج یەکە لەلای فەقیهو موجتە هیدێك دابنرێت کەجێی متمانەن تائەوانیش دەست بەدەست بیگەیننە دەستی پێشەوای نادیار ئەمەش بەدەق لەکتێبی "المذهب":٨/١٨٠باسکراوە

بۆچونی چوارەم: پاشان زاناو فوقەها کانی دواتر هاتنو وردەوردە ئەم باسەیان پێش خست تاپێش قوناغی کۆتایی هاتن و فەتوایان دا کەواجبە پێنج یەك بدرێت بە فوقەها کان تائەویش بەسەر پێ شیاواندا. دابەشی بکات بەسەر هەتیوو هەژارەکانی ئال وبەیت ئەوەی کە پەسەندتربێت ،یەکەم کەس کەمەیلی ئەم بۆچونەی هەبو(ابن حمزه) بو، لەسەدەی شەشی کۆچیدا وەك لەکتێبی "الوسيلة في نيل الفضيلة"ص٦٨٢ بەدەق باسی کردووە وەباسی لەوەکردووە کەئەم کارە باشترە لەوەی کەخاوەنەکەی خۆی هەستێ بەدابەش کردنی بەتایبەتی ئەگەرچاك نەیدەزانی دابەشی بکات

بۆچونی پێنجەم: ئیتر وردەوردەلەسەدەکانی دواتر بەرەو پێشتر چو تانزیکەی پێش سەدەیەك لەمەو پێش ، هەندێ لە فەقیهەکان فەتوای ئەوەیان دا کەدروستە لەهەندێك کاری چاکەدا کەئەو فەقیهە بەباشی دەزانێ ئەو پێنج یەکە سەرف بکرێ بۆ نمونە: وەك کەسێ قوتابی بێت یابۆبەرز ڕاگرتنی دین و هاوشێوەی ئەمانە وەك (سید محسن الحكيم )لە کتێبی (مستمسك العروة الوثقى) ٩/٥٨٤ فەتوای لەسەرداوە

ئەمە لەگەڵ ئەوەی کەدەڵێ:لەسەرف کردنی ئەوماڵەدا پێو یست ناکات بگەڕێتەوە لای فەقیهەکە، ئەمە ئەوەدەگەیەنێت کە سەرف کردنی پشکی فەقیە ،باسێك بوزیاتر ،لەم دواییانەداسەری هەڵدا کاتێ کەسەیری واقعی قوتابخانەو چاپخانەکانی خۆیان کرد کەچی مەسرەفی پێویستە.

هەروەها بیرکردنەوە لە پێویستییە تاکەکەسیەکانی خۆیان بیریان کردەوە چۆن ئەم هەمو پێویستیانە پڕبکەنەوەو بە چ شێوەیەك؟

کەئەم کارە پارە و ماڵێکی خەیاڵی دەوێ ،سەیریان کرد پێنجیەك بەڕاستی چاکترین سەرچاوەیە بۆپڕکردنەوەی پێویستیەکانی خۆیان وگەلێك سودی تاکە کەسی و سامانێکی یەکجار گەورەش لەولاوە ڕاوەستێ هەروەك چۆن ئەمڕۆ بۆ خۆمان حاڵ وگوزەرانی فەقیهو موجتەهیدەکان دەبینین، ئەم بابەتەبەزۆرقوناغدا تێ پەڕی تا دواجار لەوێدا گیرسایەوە کەدەبێ پێنج یەك بدرێت بە فقیە و موجتەهیدەکان بەمە دەرکەوت کەئەم جۆرە ،نەقورئان نەسوننەت، نەوتەی هیچ پێشەوایەکی لەسەر نەبووە ، بەڵکو بۆچونێك بووە کە زۆر دواتر هاتۆتە ئاراوە .، کەهەندێ لە موجتەهیدەکان فتوایان لەسەرداوە ،

کەئەمەش بەڕاستی پێچەوانەی قورئان وسوننەت و پێشەواکانی ئەهلی بەیتەو پێچەوانەی وتەو فتوای ئەو زانایانەشە کەجێگەی متمانەن.

وەمن لێرەوە هەموبرایانی خۆم و ئەزیزان ئاگادار ئەکەمەوە، کەنەکەن پێنجیەکی ماڵی خۆیان بدەنە فەقیهو موجتە هیدەکان ،چونکە ئەمە بۆخاوەنەکانیان ڕەوایەو هیچ مافێکی سەیدو فەقیهی پێوە نییە ، وە هەرکەسێك لە پێنج یەك بداتە کەسێك لەوان ئەوە بەڕاستی تاوانێکی

ئاشكرای كردووه چونكه پێچەوانەی وتەی پێشەوایانە ، چونكه پێنج یەك لەسەر شیعە لاچووەو عەفوكراون ،هەتا ئیمام (مهدی)بەدیار دەكەوێ.

بەڕاستی لێرەدا بە پێویستی ئەزانم كەوتەیەكی (ئایەتوللا عوزما ئیمام خومەینی ) لەم بارەوە بنوسم كەساڵی ١٣٨٩ك لەحەوزەی عیلمی بەبەرگوێی هەمومانەوە لەوتارەكانیدا وتی ،كەدواتر هەمو وتارەكانی كۆكرانەوە لەكتێبی:(الحكومة الاسلامية)یا (ولاية الفقيه).

یەكێك لەو قسانەی وتی:بەڕاستی بیر تەسكی یە ئەگەر بوترێ پێنج یەك بۆیە دانراوە تا تەنها بژێوی نەوەكانی پێغەمبەری پێ باش بكرێ ئەوان بەپشكێكی زۆر زۆر كەم ژیانیان باش دەبێ ،لەو هەموماڵەزۆرە،بەڵكو تەنها پێنجیەكی تەنهابازاڕێكی وەك بازاڕەكانی بەغداد بەشیان دەكات ،لەنێو ئەو هەمو بازاڕە بازرگانییەو گەورە و زۆرانەی كە هەن ،لە(تاران ودیمەشق و ئیسلام بول ،واتە: ئەستەنبول)،دەی ئیتر باقی ئەوماڵ و سامانەی تر چی لێبكرێ؟

پاشان دەیوت: من وای دەبینم كەحوكمی دادوەرانەی ئیسلامی ئەوەیە كە ئەو مەسروفە زۆرو گەورەیە ،ئەوەنییە لە شتێكی بێ نرخ یا لەغەیری بەرژەوەندی گشتیدا خەرج بكرێ.

پاشان دەیوت: دانی پێنجیەك تەنهاسەرانەیەك نییە بۆدابین كردنی پێویستیەكانی سەیدەكانی ،بنەماڵەی پێغەمبەر بەتەنها ،یا زەكات بەشكردن بێت بەسەر هەژارو نەبووەكاندا بەڵكو ئەمە بەچەندین جار زیاتر لە پێویستی ئەم كەسانەیە ،ئایە دەگونجێت دەسكەوتی پێنجیەك و زەكات و هاوشێوەی ئەمانە ، لەپاش دابین كردنی پێویستی هەژارونەدارەكان بكرێتە خۆراكی دەریاو

ژێر زەوی.؟!لەسەرەتای ئیسلامەوە ژمارەی ئەوسەیدانەی کەلەسەر پێنج یەك دەژیان لەسەد کەس تێ نەپەڕیوە ،خۆئەگەر دابنێین کەژمارەیان نیو ملێون دەبێت ئایا دەگونجێت و بەبیردا دێت کە ئەم هەموماڵە بێ شومارو زۆرە بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا کەتا بازرگانی و پیشەسازی پێش بکەوێت ئەو دەسکەوتەش زۆرتر دەبێت ئایا دەگونجێت ئەم ماڵە زۆرە تەنهاوتەنها بۆتێرکردنی نەوەکانی پێغەمبەر بێت؟ نەخێر

بڕوانە –الحكومة الاسلامية–:٣٩/١– ٤١چاپخانەی –مطبعة الاداب فی النجف

ئیمام (خومەینی) بەڕاشکاوانە باس لە بێشوماری پێنج یەك دەکات ئەمە ئەوکاتەی کەئیمام لەحەوزە وانەی دەوتەوە ،موحازەرەی پێشکەش دەکرد ،دەی دەبێت ئەمڕۆلەم سەردەمەی ئێمەدا چەند زۆرترو بێ شومارتر بوبێت؟،وە ئیمام بەڕاشکاوانە باس لەوە دەکات:کەئەگەر بەشێکی زۆر زۆر کەمی ئەو پارەیەش دابەش بکرێ بەشی ئال و بەیت دەکات ،دەی چی لەو ماڵە زۆرەی تر بکرێت کە دەمێنێتەوە ؟؟بۆیە پێویستە بەسەر فوقەها وموجتەهیدەکاندا دابەشبکرێت ،وەك لەوتەی ئیمام (خومەینی)دا وەردەگیرێت ،هەربۆیە ئیمام (خومەینی) ئەوکاتەی لە عێراق بو خاوەنی ماڵێکی ئێجگار زۆرو بێشومار بو بەجۆرێك کاتێك کەویستی بچێت بۆ (فەرەنسا)و ئیتر لەوێ نیشتە جێ بێ ،هەرچی پارەی ئەوکاتەی دیناری عیراقی هەبو کردی بەدۆلاری ئەمەریکی وخستیە بانقەکانی پاریسەوە بەسودێکی بانقی زۆرەوە ،.(گومان لەوەدانییە هەر کەسێك پارە لەبانکێك دابنێ سالآنە زیادەی دەچێتەسەر وەك قازانجێك چونکە ئەوپارەیە لەوبانکەدامامەڵەی پێوەدەکرێ ،ئەمەش ڕیبا خواردنێکی ئاشکرایە ).

بەڕاستی خراپ بونی مرۆڤ لە دو ڕێگەوە دێت ماڵ وسێکس هەردوکیان بۆزاناشیعەکان ئاسانە بۆ نمونە: پێش ودوای ئاقرەت ،لەڕێگەی کاری موتعەوغەیری موتعەوە ، سامان و دارایش لەڕێگەی پێنجیەك و ئەوپارە وشتانەی دەخرێنە نێو مەزارو شوێنە پیرۆزەکان دەی ئیتر کێ دەتوانێ لەوان لەبەرامبەر ئەم هەموشتە فریودارانەدا خۆی بگرێت بەتایبەتی ئەگەر بزانێت کەهەندێکیان بۆیە ئەم ڕێگەیەیان گرتووە ،تەنها لەبەر تێرکردنی ئارەزوی سێکسی ودارایە ..؟؟؟!!!!!!!!

ئاگاداریەك:

مل ملانێ و کێ برکێ لەنێوان سەیدو موجتەهیدەکاندا لەسەر دەست کەوتنی پێنجیەك دەستی پێکردووە بۆیە هەریەك لەوانە دەستی کردووە بەکەم کردنەوەی ئەو ڕێژەیەی کە لە پێنج یەکدا،لەخەڵکی وەردەگرێ تازۆرترین خەڵك بچن بۆلای ئەو هەربۆیە چەندین فێڵ وتەڵەی شەیتان ئامێزیان داهێناوە ، هەتا جارێك کابرایەك هات بۆلای (سیستانی) وپێی وت:قوربان مافی پێنجیەك بەجۆرێك لەسەرم کەڵکە بووە گەیشتۆتە (پێنج ملیۆن) وە من دەمەوێ نیوەی بدەم واتە (دوملیۆن ونیو) (سیستانی)ش پێ ی وت: باشە (دو ملیۆن ونیو)ەکە بدە ،کابراش دای بە(سیستانی) و ئەویش لێ ی وەرگرت و ،بەکابرای وت :ئەوا منیش بەخشیمەوە ،بەخۆت کابراش (دو ملیۆن ونیو)ەکەی وەرگرتەوە ، پاشان (سیستانی) پێ ی وت :جارێکی تر ئەم پارەیە ببەخشە ،کابراش پارەکەی دایەوە ،بە (سیستانی)،( سیستانی) بەکابرای وت: ئەمە وەك ئەوە وایە کەتۆ پێنج ملیۆنەکەت دابێت ئەوا ئیتر گەردنت پاك بۆوە ، جاکاتێ ئەوانی تر ئەمەیان لە(سیستانی) بینی ئەوانیش هەمان ڕێگەی ئەویان گرتەبەر

تەنانەت هەندێکیان چەندین ڕێگەی تری داهێنا تاخەڵکی بێن بۆلای ئەوان ئیتر بووە کێ بەرکێ یەکی شەریفانە لەنێوان سەیدەکاندا بۆ دەست خستنی پێنج یەك وای لێ هات پێنج یەك وەك شێوەی کەمکردنەوەی نهێنی لێ هات زۆرێك لە دەوڵەمەندەکان پێنج یەکیان دەدا بەو کەسەیان کەلەوانی تر کەمتر وەردەگرێت.

جاکاتێ سەرۆکی حەوزەی عیلمی بینی کێ بەرکێکە توند بووە لەسەر پێنج یەك و ئەو ڕێژەی پێنجیەکەی دەگاتەلای ئەو زۆرکەمە هات فەتوای دەرکرد کەنابێ لەخۆوە هەرچی بەخۆی وت سەید پێنجیەکی بدرێتێ ، بەڵکودەبێ بدرێ بەچەند کەسایەتییەکی دیاری کراو وەدەبێ پشکی شێریش بۆسەرۆکی حەوزە بێت یا ئەو نوێنەرانەی کە ئەم دایان دەنێ لە ناوچەکاندا

وەپاش تەسلیمکردنی ئەم هەمو ماڵە، ئەویش هەڵدەستێت بەگۆڕینەوەیان بە "ئاڵتون"بەجۆرێك کەتانێستا دوژوری پڕ لەئاڵتونی هەیە

ئیتر ئەوانەشی کە نوێنەرەکانی بۆخۆیان دەیدزن بەبێ ئاگاداری ئەم ئەوە ئەوەندە زۆرە هەرباس ناکرێ

پێشەوای باوەڕداران خوا لێی ڕازی بێت دەڵێ:{ خۆشبەختی بۆ دنیانەویستان و ئارەزومەندانی دوارۆژ،ئەوانەی زەوییانکردۆتە ڕاخەر بۆخۆیان و خۆڵەکەیان کردۆتە فەرش و ئاوی زەویشیان کردۆتە بۆن وبەرام بۆخۆیان و ،قورئانیان کردۆتەبەرگ و پاڕانەوەیان کردۆتە پۆشاك بۆخۆیان، پاشان لەسەر ڕێبازی مەسیح دنیایان داوە بە قەرز.......،(داود) سلاوی لەسەر، لەشەوداو لەکاتێکی ئاواهەڵدەستاو دەیوت ئەمە کاتێکە هەربەندەیەك داوابکات وەڵام دەدرێتەوە

،تەنهانەو کەسانە وەلاّم نادرێنەوە کەدەیەك لە خەڵکی دەسێنن ،یاسەرۆکی پۆلیس بێ یا پۆلیس بێ  نهج البلاغة ج :٤/٢٤

وەرە بەراوردێك لەنێوان ئەم قسەیەی پێشەوای باوەڕداران و حاڵ و گوزەرانی سەیدو فەقیهەکان بکەو خۆت بڕیاربدە ئەم دەقەو چەندین دەقی گەورەی ئاوەها لەو دەقانەن کەبەڕاستی بە هیچ جۆرێك ڕەنگ دانەوەی نییە لە نێو سەیدو فەقیهەکاندا ژیانی خۆش و ڕابواردنی لەسنوربەدەر ، دنیانەویستی پێشەوای باوەڕدارانی بیر بردونەتەوە و بیرو هۆشی کوێرکردون ،لەبیرکرنەوەی وتەکانی و پابەندبون پێوەیان

(دەیەك سێن) ئەو کەسەیە کەسەرانەو باجی یەك لەسەردەی شت وەك دەسێنێ ، ئەمە وەك پێشەوای باوەڕداران ڕەزای خوای لێبێت، وتی بەهیچ جۆرێك پاڕانەوەی وەلاّم نادرێتەوە ،دەی دەبێ ئەو کەسەی پێنج یەك لەخەڵکی وەردەگرێ؟بێگومان پاڕانەوەی وەلاّم نادرێتەوە ،چونکە ئەوەی لە پێنجیەك ،وەردەگیرێ ،دوئەوەندەی دەیەکە.

ئاگادارییەکی تر:

لە پێشەوە زانیمان ،کە پێنج یەك نادرێ بە فەقیهو موجتەهیدەکان،وە لەچوارچێوەی بابەتێکی تایبەتەوە،هەمولایەنەکانمان ڕون کردەوە لێرەدا پێم باش بو کە ئاگاداری ئەوە بدەین ،کەچەندین فەقیە و موجتەهیدو مەرجەعی دینی هەیە وادەردەخات کەئەمانە لە ئال و بەیتن ،بۆیە هی وایان دەبینیت یەك ڕیز پشت ونەسەبت بۆدەگێڕیتەوە تادەگاتەوە ئیمام (کاظم) خوالێی ڕازی بێت ،بزانە شتێکی زۆرمەحاڵە ئەو هەمو ڕیژە زۆرە لە فەقیهەکان لە عێراق و سوریاو ئێران و لوبنان و...دەوڵەتانی کەنداو و هندو پاکستان و چەندین جێگەی تر ،ئەمانە هەمو لە ئەهلی بەیت بن خۆ ئەگەر کەسێك بەس بەتەنها ئەو ژمارە بێ

شومارەی عێراق ببڕێڕیٚ دەگاتە ئەوەی کە زۆر ئەستەمە ئەم ژمارە زۆرە لە ئەهلی بەیت بن چ جای ئەوانەی ولاّتانی دیکە ،بیٚ گومان کەژمارەیان چەندین بەرامبەرە ،ئایا دەگونجێت ئائەمانە هەموله ئەهلی بەیت بن؟؟؟

لەسەرو هەمو ئەمانەشەوە ،زنجیرەی نەسەب لە (حەوزە)کڕین وفرۆشتنی پێوە دەکرێت بۆیە هەرکەس بیەوێت نەسەبی ئەهلی بەیتی دەست بکەویٚ ،تەنها ئەوەندەی لەسەرە کە خوشکەکەی یا هاوسەرەکەی بهێنێت بۆیەکێك لەسەیدەکان تاڕابوێرێت لەگەڵیدا بەمەرجێك جوان و شۆخ و شەنگ بن.یان دەتوانیٚ بەهەندێك پارە بەم دو ڕێگەیە ئەتوانێت شەرەفی نەسەبی ئەهلی بەیت بۆخۆی دەست بخات .ئەمەش کارێکی زۆر دیارە کە لە حەوزەدا هەیە بۆیە دەڵێم ئەوەی هەندێك لەسەیدو نوسەرەکان دەیکەن ،کەلە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکەیدا زنجیرەی نەسەبی خۆی دەنوسێت تاسادەو هەژارانی پیٚ فریو بدات و پێنجیەکی ماڵ و سامانیان بخوا ،ئەم جۆرە شتانە فریوتان نەدەن

لەکۆتایی باسی پێنجیەکدا دەمەوێت وتەیەکی برای بەڕێزو شاعیرو تێکۆشەرم "أحمد الصافي النجفي"ڕەحمەتی لێبێت باس بکەم ،کاتێك کە پلەی (موجتەهید)م وەرگرت ،ئەوکات ناسیم و دواتر بوینە دو هاوڕیٚ ی گیانی بەگیانی ،ئەگەرچی جیاوازییەکی گەورەی تەمەنیشمان لە نێواندا هەبو کە٢٠ساڵ یازیاتر دەبو هەموکات پێی دەوتم { ئەی کوڕی خۆم حسین ،نەکەی دەرونت بەهۆی پێنج یەکەوە گلاّ وبکەی چونکە ئەوە حەرامە} لەباسی پێنج یەکدا گفتوگۆی لەگەڵدا کردم تا قەناعەتی پیٚ هێنام کە حەرامە ،پاشان چەند کۆپلە شعرێکی بۆ باسکردم کەبەو بۆنەیەوە نوسیبوی منیش وەك یادگارییەك

لەدەفتەری یادەوەرییەکانمدا پاراستومە وە ئێستا وەك خۆی بۆخوێنەرانی بەڕێزی دەنوسم ،ڕەحمەتی خوای لێبێت وتویەتی

| | |
|---|---|
| عجِبتُ لقومٍ شحذّهم بِاسم دينِهم | وكيف يسوغ الشحذ للرجلِ الشِهمِ؟! |
| لئن كان تحصيل العلوم مُسوغا | لذاك فان الجهل خيرُمن العلم!!! |
| وهل كان في عهد النبي عصابة | يعيشون من مالِ الانام بذا الاسم؟! |
| لئن أوجبَ اللهُ الزكاة فلم تكُن | لتُعطى بذُل بل لتؤخذ بالرغم |
| أتانا بها أبناء ساسان حرفة | ولم تكن في أبناء يعرُب من قدمٍ |

بەشێوەی پەخشان ئەمەواتاکەیەتی

سەرسامم لەکەسانێك کەبەناوی دینەوە حەرام دەخۆن ئاخۆ چۆن دەگونجێت بۆ پیاوی داناو ژیر حەرام بخوات؟

ئەگەر وەرگرتن و فێربونی زانست هۆکارێك بێت بۆ ئەم حەرام خۆرییە ئەوا بەڕاستی نەزانی چاکترە لە زانست ،ئایا لەسەردەمی پێغەمبەردا هیچ دەستەو گروپێك هەبوە تابەم ناوەوە لەسەر ماڵی خەڵکی بژین ؟

خۆئەگەر خوا زەکاتی واجبکردبێ واجبی نەکردووە بە مل کەچی بدرێ بەڵکو بەزۆردەبێ بسەندرێ و وەربگیرێ ،ئەم حەرام خۆرییە نەوەکانی ساسانییە کان واتە "فارسەکان" وەك پیشەیەك بۆ ئێمەیان هێناوە ،دەنا نەوەکانی (یعرب) کەمەبەست عەرەبەکانە لەکۆنەوە شتی وایان تیدا نەبووە

## کتێب و پەڕاوە ئاسمانییەکان

گومان لەوەدانییە کەلای گشت موسوڵمانان قورئان ئەو کتێبە ئاسمانییەیە کە لای خواوە دابەزێنراوە بۆسەر پێغەمبەری ئیسلام ،(محمدی کوڕی عبدُ الله ) سلاّوی خوای لەسەر بێت

بەلاّم بەهۆی زۆرخوێندنەوەو گەڕانی خۆمەوە بەناو سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی خۆمانەوە ناوی چەند کتێبێکم پێش چاوکەوت ،فوقەهاو زاناکانی ئێمە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەم کتێب وپەڕاوانەش هاتون بۆ محمد (صل الله علیه و سلم) وەئەویش تایبەتی کردووە بە پێشەوای باوەڕداران ،(علی) ڕەزای خوای لێبێت ،ئەوکتێبانەش بریتین لە

١- الجامعة:

لە(ئەبو بەصیر)ەوە ئەویش لە (أبو عبد الله) وە دەڵێ من محمدم وەکتێبی (جامعة) لای ئێمەیە ئەو خەڵکە چوزانێ کە کتێبی (جامعة) چییە؟

(أبو بصیر) وتی: بە فیدات بم کتێبی (الجامعة) چی یە ؟

(أبوعبدالله) وتی :پەڕاوێکە حەفتاباڵ بەباڵی پێغەمبەر (صل الله علیة و سلم) درێژە ،لەدەمی ئەوەوە وەرگیراوە و بەدەستی ڕاستی عەلی نوسراوەتەوە ،حەلاّڵ وحەرام و هەرچی خەڵکی پێویستیان بێت تیایدایە ،هەتاباسی پارەو تولّەی ڕوشاندنیشی تێدایە...هتد بڕوانە /الکافی :١/٢٣٩، و بحار الانوار :٢٦/٢٢.

وەچەندگێڕانەوەیەکی تریش کەلەم کتێبانەدا دەبینرێت (الکافی) (البحار) (بصائر الدرجات) (وسائل الشیعة) ئێمە لەبەرکورتی باسەکە تەنهایەك ڕیوایەتمان هێناوە ،من تێناگەم ئەگەر (الجامعة)ڕاستە یان نا وە هەمو شتێك کە خەڵکی پێویستی پێی هەبێت تاڕۆژی دوایی تێداباسکرابێت ئەی

بۆشاردراوەتەوە؟ ،لەهەمو حەلاڵ و ئەو بڕیارانـە بـێ بـەش بـوین ؟،ئایـە ئەمـە شاردنەوەی زانست نییە؟

٢-صحيفة الناموس :

لەباسی نیشانەکانی ئیمام (مەهدی)دا خوای لێ ڕازی بێ دەڵـێ: پـەڕاوێکی لایـە ناوی هەمو شیعەو لایەنگرانەکانی تێدایە تـاڕۆژی دوایـی وەپـەڕاوێکی دیکـە کـە نـاوی دوژمنـەکانی تێدایـە تـاڕۆژی دوایـی کـە چـەندە کەسـن. بحـارالانوار ١١٧/٢٥

وەلەبەرگی ٢٦داچەند ڕیوایەتێکی دیکـە هەیـە ،جـامن دەپرسم داخـۆ ئـەوە چ پەڕاوێك بێت کە دەبێت ئەوەنـدە فـراوان بێـت نـاوی هەموشـیعەکان کـەتاڕۆژی دوایی دێن تیایدابێت ،خۆئەگـەر بەتـەنها نـاوی شـیعەکانی عێـراق تۆمارکرابێـت ،لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆدا پێویستمان بەلای کەمەوە سـەد بـەرگ دەبێـت چ جـای تۆمـارکردنی شـیعەکانی (ئێـران و،هنـد وپاکـستان و،سـوریا،و لوبنان،ودەوڵەتەکانی کەنداو) ؟،وە بە درێژایی ئەو هـەمو سـەردەم وچاخانەی کەلەدەسـت پێکـردن و سـەرهەڵدانی شـیعەوە تـا ئـەمڕۆ هـاتووە پێویـستمان دەبێـت بەچـەند بێـت بۆتۆمـارکردنی نـاوی ئەوشـیعانەی کەلەسـەدەکانی پێشوترەوە هەبون تاڕۆژی دوایی وەدەبێ چەندەمان بوێت بۆتۆمارکردنی نـاوی دوژمنانی شیعە لە سـەرەتای دەرکـەوتنی(صـحيفة النـاموس)؟خۆئەگـەر دەریـا بکرێتە مەرەکەب وحەوت ئەوەندەی تریش هێشتا بۆئەو ژمـارە خـەیاڵییـە زۆرە لەتۆماری ناوی ئـەو خـەڵکە هێـشتا بـەش ناکـات ،ئەگـەر هەرچـی کۆمپیوتـەرو ئـەقڵی ئـەلیکترۆن هەیـە بـەتاز ەتـرین و پێـشکەوتو تـرین جـۆر یانـەوە کـۆ بکەینەوە هێشتا ناتوانێ ئەو ژمارە خـەیاڵییەی یا بڵێین لەتوانا بەدەرەلەوناوانـە

له خۆبگرێ ؟ بەڕاستی مێشکی ڕەشە خەڵك ناتوانێ شتی لەم جۆرە گێڕانەوانە وەربگرێت چ جای کەسە ژیرو داناکان

زۆرئەستەمە کە پێشەوایان(سلاّویان لەسەر)لەمجۆرە قسانەو شتی وایان وتبێ کە هیچ ژیری و لۆژیکێك ئەمە وەرناگرێ ،ئەگەر دوژمنانمان بەم گێڕانەوانە بزانن چیان پێ خۆش بێ پێمان دەڵێن و دەکەونە تانەو تەشەر لە دینی ئیسلام و تورەیی دڵی خۆیانی پێ خامۆش دەکەن.

٣-صحيفة العبيطة:

پێشەوای باوەڕداران خوا لێی ڕازی بێت دەفەرموێت:(سوێند بەخوا گەلێ پەڕاوو پارچە نوسراوی زۆرم لەلایە کەهی پێغەمبەرە (صل الله عليه و سلم) و بنەماڵەکەیەتی،وەلەناو ئەوانەدا پەڕاوێکی تێدایە پێی دەوترێ (العبيطة) هیچ پەڕاوێك ئەوەندەی ئەو پەڕاوە لەسەر عەرەب توند نییە ، وە (شەست) هۆزی عەرەبی تێدایە کە لەسەر ناڕەواین ،کەلەدینی خودا دا هیچ پشکێکیان نییە) بحار الأنوار: ٣٧/٢٦

ئەم ڕیوایەتە بەهیچ جۆرێك نەوەردەگیرێ ونەژیری مرۆڤیش بڕوای پێدەکات ،چونکە ئەم ژمارە هۆزانەی عەرەب کە هیچ پشکیان نەبێت لەدینی خوادا واتە هیچ موسوڵمانێکیان لەدینی خواداپشکیان نییە پاشان دیاری کردنی ئەم هۆزە عەرە بانە بەم حوکمە توندەوە بەڕاستی.ئەمە بۆنی ڕەگەز پەرستی لێدێت ،لەباسی داهاتودا ئەم بابەتە ڕون دەکە ینەوە.

٤- صحيفة ذؤابة السيف:

(ئەبو بصير) دەڵێ: (ئەبو عبد الله) خوالێی ڕازی بێت دەیوت: لەو شوێنەی کە پێغەمبەر (صل الله عليه و سلم ) دەسکی شمشێرەکەی پێدا هەڵئەواسی

پەڕاوێکی بچوکی تێدابو ئەو پیتانەی تێدابو کە بەهۆی هەرپیتێك لەو پیتانە گرێ ی هەزار پیتی تر دەکاتەوە

وە(ئەبو عبدالله) دەیوت: هەتا ڕۆژی دوایی دو پیت لەو پیتانە دێنە دەرەوە .بحار الأنوار :٢٦ /٥٦

باشە ئەی پیتەکانی تر لە کوێیە ؟ باشە نابێت ئەو پیتانەی تر بهێنرێنە دەرەوە تادۆستان و لایەنگرانی ئەهلی بەیت لێی سود مەند بن؟ ،یائەمەش بەنهێنی دەمێنێتەوە تا مەهدی بەدیار دەکەوێت ؟.

٥- صحيفة علي:

کەئەمەش پەڕاوێکی ترە لەو جێگەیە دا دۆزراوەتەوە کە دەسکی شمشێرەکەی پێغەمبەری پێداهەڵواسرا بو

(ابوعبدالله) خوالێ ڕازی بێت ،دەڵێ: لەو جێگەیەی کەدەسکی شمشێرەکەی پێغە مبەر(صل الله عليه و سلم)ی پیاداهەڵواسرا بو پەڕاوێك دۆزرایەوە.ئەمەی تێدانوسرابو بسم الله الرحمن الرحيم سەرگەردانترین کەس لەڕۆژی دوایدا ئەوکەسەیە کە غەیری بکوژی خۆی بکوژێ ،وەلە غەیری لێدەری خۆی دەدا وەهەرکەسێك دۆستایەتی غەیری دۆستانی خۆی بکات ئەوە کافرە بەو شتەی کە هاتۆتە خوارەوە بۆ محمد کە (قورئانە) .وەهەرکەسێك کارێکی نابەجێ دابهێنێت یا ستەم کارێك دالّدە بدات ئەوە خودا لەڕۆژی دوایدا هیچ سوننە ت و فەرزێکی لێوەرناگرێ)بحار الانوار٢٧/،٦٥,١٠٤/٢٧٥

٦- الجفر:

دوجۆرە :الجفرالابيض ، الجفر الأحمر:

(أبو العلاء) دەڵێ: بیستم لە (أبو عبدالله) دەیوت: (الجفرالابيض) م لەلایە، وتم چ شتێکی تێدایە ؟وتی زەبوری داود و،تەوراتی موسا وئینجیلی عیسا

وصوحوفی ئیبراهیم، سلاَویان لەسەر ،هەروەها حەلاَلّ وحەرامیشی تێدایە...وە (الجفر الأحمر )یشم لەلایە ،وتم :ئەو چ شتێکی تێدایە؟وتی: ،چەك، ئەمەش تەنها بۆ خوێن ڕشتن دەکرێتەوە کە خاوەنی شمشێر بۆ کوشتن دەیکاتەوە

جا (عبدالله بن أبی الیعفور)، پێی دەڵێ: خوا چاکت بۆبکا ئایا نەوەکانی حەسەن ئەمە دەزانن ؟ئەویش وتی :بەڵێ سوێند بەخوا هەروەك دەزانن شەو شەوە،ڕۆژیش ڕۆژە بەلاّم حەسەدو شوێنکەوتنی دنیاوایان لێدەکات کە نکوڵی لەمە بکەن خۆئەگەر ئەوان بەڕاستی شوێن ڕاستی بکەوتنایە ئەوە چاکتر بو بۆیان)     اصول الکافی ٢٤/١

جا من بۆخۆم پرسیاری (الجفرالأحمر)،وە ▪ کەسێکیشە کەدەیکاتەوەو وە خوینی چ کە سێکیش دەڕژێت.؟

ئەم پرسیارانەم لەئیمام (خوئی) کۆچکردو کرد ،ئەویش وتی : ساحێبی زەمان واتە (مهدی) دەیکاتەوە و،خوێنی نەواسیبەکانی پێ دەڕێژێ (واتە:سوننەکان ) پەرت وبلاّویان دەکات ئەوەندە خوێنیان دەڕێژێ بە ئەندازەی (دیجلە) و(فورات) ،وە تۆڵە لە هەردو بتەکەی قورەیش "مەبەست :(ابوبکر وعمر)ە و هەردوکچەکانیان (عائشة و حفصة) وە ئەوەشی کە بە کرێگیراوی دەزانین (واتە عوسمان) وەلە هەمو نەوەکانی (ئومەییە و عباس) تۆڵە لەمانە ،هەمویان دەکاتەوە و گۆڕەکانیان هەڵدەداتەوە ،

بەڕاستی ئەم وتەیەی ▪ ئیمام خوئی زیادەڕەوییەکی ئێجگار زۆری تێدایە ▪ چونکە بەڕاستی ئەهلی بەیت ،زۆر لەوە بەرزتر و بەرێزترن ، کەبچن گۆڕی مردویەك ▪ هەڵبدەنەوە ،کە بەچەندین سەدە بەسەر مردنیدا تێپەڕیوە ،.

پێشەواکان ،سلاَویان لەسەر ▪ هەمیشە کاری خراپە کەبەرامبەریان کرابێت ،بەچاکە وەلاّمیان داوەتەوە و ،لێ بوردەبون بە هیچ جۆرێك ناچێتە ژێری

کەسی ژیرەوە ، کەبچن گۆڕی مردوانێك هەڵ بدەنەوە ، تاتوڵەیان لێبنەنەوەو سزایان بدەن دەی خۆ مردوسزای شەرعی لە سەر نییە ، وەبنەماڵەی بەیتیش بەچاکەو لێبوردەیی ودڵ فراوانی نلسراون .

٧- مصحف فاطمة:

أ- (ابوعبدالله) دەڵێ: ( موسحەفی فاطمة ،لەلای ئێمەیە هیچ ئایەتێکی قورئانی تێدانییە ،پێغەمبەر ( صل الله علیە و سلم ) وتویەتی وعەلیش بەدەستی خۆی نوسیویەتییەوە )    بحارالأنوار٢٦/٤١.

ب- لە(محمد بن مسلم )ئەویش لەیەکێکیانەوە خوالێی ڕازی بێ دەڵێ: ( فاطمة لەپاش خۆی موسحەفێکی لێ بەجێما کە قورئان نەبو بەلآم وتەیەك بو لەوتەکانی خوا ، کە بۆ فاطمة دابەزێنراوە ،پێغەمبەر خوێندویەتییەوە و عەلیش نوسیویەتییەوە ) بحارالأنوار ٢٦/٤٢.

ج- (علی بن أبی حمزة) دەڵێ :(أبو عبدالله) وتویەتی: (..... موسحەفی فاطمة سلآوی لەسەر ،لەلای ئێمەیە سوێند بەخوا هیچ پیتێکی قورئانی تێدانییە ،بەلآم ئەوەندە هەیە پێغەمبەر (صل الله علیە و سلم) خوێندویەتییەوە وعەلیش نوسیویەتییەوە ). بحار الانوار ج٢٦ص٤٨.

جائەگەر کتێبێك پێغەمبەر خوێندبێتییەوەو عەلیش نوسیبێتییەوە ،دەی بۆ لە ئوممەت شاردراوەتەوە ؟ خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر (صل الله علیە و سلم ) دەکات کەئەوەی بۆی ڕەوانە دەکرێ بیگەیەنێت وەك دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ......)المائدة /٦٧.

چۆن ڕەوایە پێغەمبەر (صل الله علیه و سلم )ئەم قورئانەلەهەمو موسوڵمانان بشارێتەوە ؟ وەچۆن دەگونجێ پێشەوای باوەڕداران وپێشەوایانی دوای خۆی شت لەلایەنگرانی خۆیان بشارنەوە؟

٨- تەورات وئینجیل وزەبور

(أبو عبدالله) دەستوری وابو کە تەورات و ئینجیل و زەبوری بەزمانی سورەییانی دەخوێندەوە. الحجة من الکافی ج١ص٢٠٧ ،باب ان الأئمة علیهم السلام ، عندهم جمیع الکتب التی نزلت من الله ،وانهم یعرفونها کلها علی اختلاف السنتها.

٩-قورئان

قورئان پێویست بە هیچ دەقێك ناکات بۆسەلماندنی بەڵام ئەوەندە هەیە کتێب و نوسراوی فەقیهەکان وتەواوی موجتەهیدەکان لەسەر ئەوە کۆکن ،کە قورئان گۆڕاوە وە قورئان تاکە کتێبێکە لەناو هەمو ئەو کتێبانەی تردا کە دەست کاری تیاداکراوە.

وەفەرمودەناس( النوری الطبرسی) کتێبێکی زۆرگەورەی لەسەر گۆڕان ودەستکاری قورئان داناوە بەناوی (فصل الخطاب فی إثبات تحریف کتاب رب الأرباب )زیاد لە دو هەزار ڕیوایەتی تیادا کۆکردۆتەوە کە دەق دەنێ بەوەی کە قورئان دەستکاری و شێوێندراوە و وتەی هەمو فەقیهو زاناکانی شیعەی تیادا کۆکردۆتەوە .کەبەڕاشکاوی باس لە شێواندن و دەستکاری کردنی ئەو قورئانە دەکەن کە ئەمڕۆ والەبەردەستی موسوڵماناندایە ،لەوێدا ئەوە دەسەلمێنێت کە هەمو زاناو شارەزاکانی شیعە لە پێشینەو پاشینەکان دەڵێن: ئەم قورئانە کە ئێستا بونی هەیە شێوێندراوەو دەستکاری تیاداکراوە

(...سد هاشم البحرانی) دەڵێ :{ لەپاش گەڕان و لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوتووە کە ئەو قسەیەی کە دەڵێ قورئان شێوێندراوە ڕاست ودروستە ، بەجۆرێ کە دەکرێ بوترێ ئەمە یەکێکە لە کارە پێویستییەکانی مەزهەبی شیعە وەیەکێکە لە گەورەترین هۆکارو مەبەستەکانی داگیرکردنی جێنشینایەتی }

بڕوانە پێشەکی کتێبی (البرهان) الفصل الرابع ص٤٩

(سید نعمة الله الجزائری )، لەوەڵامی ئەوانەی دەڵێن قورئان نەشێوێندراوە دەڵێ:

(تەسلیم بون بەوەی کە ئەم قورئانە بەڕێگەیەکی تەواتور سروشێکی خواییەو هەرهەموی جوبرائیلی ئەمین هێناویەتی وادەکات کە هەمو ئەو هەواڵانەی کەباس لەشێواندنی قورئان دەکات وەلابنرێ لەگەڵ ئەوەی کە هەمو زانایانمان یەکدەنگن لەسەرڕاستی شێواندی قورئان )الانوار النعمانیة :٣٥٧/٢

هەربۆیە (ئەبو جەعفەر)دەڵێ: وەك (جابر) لێوەی دەگێڕێتەوە وتویەتی: (هەرکەس بانگەشەی ئەوە بکات کە هەمو قورئانی کۆکردۆتەوە ئەوە درۆزنە کەس هەمو قورئانی کۆنەکردۆتەوەو لەبەری نەبووە تەنها (علی بن أبی طالب) و پێشەواکانی دوا خۆی نەبێت ) الحجةمن الکافی :٢٦/١

گومان لەوەدانییەکە ئەم دەقەبەڕاشکاوی ئەوەدەسەلمێنێ کەئەم قورئانەی ئەمڕۆ لەبەردەستی موسوڵماناندایە ،شێوێندراوە

وەقورئانی ڕاستەقینە ئەوقورئانەیە کەلەلای (علی)بووە و دواخۆشی کەوتۆتە لایپێشەوایان سلاویان لەسەردواجاردەچێتەلای ئیمام (مهدی ).

هەرلەبەرئەوە کاتێك کە ئیمام (خوئی) لەسەرە مەرگدابو ئامۆژگاری ئێمەی دەکرد وەك مامۆستایانی حەوزە پێی دەوتین:(داواتان لێدەکەم دەست بەم قورئانەوە بگرن ،هەتاقورئانەکەی فاطمة بە دیاردەکەوێ ) مەبەست

لەقورئانەکەی فاطمة ئەوپەڕاوەیە کە عەلی کۆیکردۆتەوە وەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا

بەڕاستی لەهەموی سەیرترو سەرسوڕهێنەرتر ئەوەیە کەئەم هەموپەڕاوانە لەلایەن خواوە هاتووەو تایبەتە بە عەلی وپێشەوایان لەدواخۆی کەچی هەرهەمویان شاردراونەتەوە لە ئومەتی ئیسلام ،، بەتایبەت لەدۆستان ولایەنگرانی ئەهلی بەیت جگەلەقورئانێکی سادەنەبێت کەدەستکاری تیاداکراوەو لێی زیادو کەم کراوە وەك فەقیهەکانمان دەڵێن.

جائەگەر بەڕاستی ئەو کتێبانەلەلایەن خواوە دابەزێنراوەو پێشەوای باوەڕدارانیش دەستی کەوتووە ،ئیتر دەبێ چ واتایەك هەبێت لەشاردنەوەیاندا لەم ئوممەتە کەلەهەموکات زیاتر پێویستی پێیان هەیە بۆژیان و پەرستش کردن پێی؟

زۆرێك لەزاناکانمان ئەوە بەبەهانەدێننەوە کەدەڵێن لەبەرترسی دوژمنان!!!

وەئێمەش دەپرسین ئایا پێشەوای باوەڕداران وشێری نەوەی هاشم ئەوەندە ترسنۆك بووە کەنەتوانێ بەرگری لەو پەڕاوانە بکات؟

ئایائەم هەمو شتەی شاردۆتەوە و ئوممەتی لێ بێ بەش کردووە تەنهالەترسی ناحەزان؟

نا،سوێند بەخوا (علی بن ابی طالب) جگەلەخوا لەکەسی تر نەترساوە خۆئەگەر بش پرسین:ئەمیری ئیمانداران و پێشەوایان ،لەدواخۆی دەبێ چی لەزەبور و تەورات وئینجیل بکەن ،لەنێوخۆیان دا ،ئاوها بەنهێنی دەیخوێننەوە؟

ئەگەر ئەو دەقانە باس لەوەدەکەن ، کەتەنها (عەلی) قورئانە تەواوەکەو تەراوی پەڕاو وکتێبەکانی تری دەست کەوتووە ئیتر پێویستی چی هەبووە بە تەورات وزەبور و ئینجیل؟

بەتایبەت کە بەهاتنی قورئان ئەو کتێبانە هەڵوەشێنراونەتەوە ؟

بەڕاستی من واهەست دەکەم کەچەند دەستێکی پیس ئەم ڕیوایەتانەی دروستکردبێ و بەدەم پێشەوایانەوەی هەڵبەستبێت (انشاء الله) لەباسێکی تایبەتدا ئەم باسە دەسەلمێنین

هەمومان دەزانین کەئیسلام یەك کتێبی هەیە ئەویش قورئانی پیرۆزە ،ئیتر کتێبی جۆراو جۆرو ژمارەی جیاجیا لەو هەمو پەڕاوانە ئەمە لەتایبەت مەندییەکانی جولەکەو گاورەکانە وەك دیارە دەربارەی کتێبە پیرۆزەکانیان

ئەو وتەیەی کەدەڵێ: پێشەوای باوەڕداران ئەو هەمو کتێبەی دەست کەوتووەو هەمو ئەمانەش لەلایەن خواوە هاتون ، وەباس وخواسی شەرعی تێدایە بەڕاستی وتەیەکی بەتاڵەو هەندێ لەو جولەکانە ،هەڵیان بەستووە ،کەلەژێرپەردەی شیعە گەرێتیدا خۆیان حەشارداوە

## تێڕوانینی شیعە بەرامبەر خەڵکی سوننە

کاتێك کتێبە باوەڕپێکراوەکانی خۆمان دەخوێنینەوەو لەوتەی فوقەهاو شارەزایانی خۆمان دەڕوانین بۆمان دەردەکەوێ کەتاکە دوژمنی شیعە بەتەنهاو تەنها سوننییەکانن ،هەربۆیە چەندەها ناویان لێناون بۆنمونە بە سوننەکان دەڵێن (العامة ) واتە ڕەشە خەڵك هەروەها پێیان دەڵێن (نواصب) ،وەتائێستاش بیروباوەڕێك لەلای شیعەکان هەیە کەپێیان وایە هەمو کەسێکی سوننی کلکێکی لەدواوە هەیە ،وەئەگەر دو کەسی شیعە لە ناو خۆیاندا جنێوێك بەیەکتر بدەن بۆنمونە: گەریەکێکیان ویستی جنێوێکی زۆرخراپ بەوەی بەرامبەرەکەی بڵێ ،پێی دەڵێ ( ئێسك وپروسکی سوننییەك لەگۆڕی باوکتدایە) چونکە سوننە لای شیعە گڵاوو پیسن بەجۆرێك ئەگەر هەزارجاریش خۆی بشوا هەر پاك نابێتەوە

تائێستاش ئەوەم لەیادە کە باوکی ڕەحمەتیم جارێك لەنێو بازاڕەکانی شاردا پیاوێکی غەریب دەبینێ ،جابەڕاستی باوکم یەکجار حەزی لە پیاوەتی دەکرد جاپیاوە غەریبەکەی هێنایەوە بۆماڵەوەمان تائەو شەوە وەك میوان لە لامان بمێنێتەوە ،ئیتر ئەوەندەی خواویستی بو ڕێزمان گرت تادرەنگانێك لەدوا نانی ئێواریێ دانیشتین قسەمان دەکرد ، من ئەوکات لاو بوم وسەرەتای خوێندنم بو لە حەوزە ،لەئەنجامی قسەکردنمان لەگەڵیدا بۆمان دەرکەوت ئەم کابرایە سوننە مەزهەبەو خەڵکی دەوروبەری شاری( سامەڕا)یەو بەئیشێك هاتبووە شاری (نەجەف) ئەو شەوە مایەوەو بەیانیش نانی بەیانیمان بۆ هێنا ،کاتێك پیاوەکە ویستی بڕوا باوکم ئەندازەیەك پارەی بۆ ڕاگرت ؛ تا نەوەکو لەسەفەرەکەیدا پێویستی بێت، ئیترزۆر کابرا سوپاسی کردین لەسەر ئەو میواندارییە ،کاتێك کە ڕۆشت باوکم فەرمانی کرد ئەو جێگەو پێخەفەی ئەوکابرایە لەسەری نوست بو بیسوتێنین و ئەو قاپ و قاچاخەی کەنانی تێداخواردووە جوان جوان پاك بکرێتەوە ،چونکە پێی وابو کەسوننە گڵاون ،جائەمە باوەڕی هەمو شیعەیەکە چونکە زاناکانمان سوننە وەك بێ باوەڕو ،بەرازو، هاوەڵ پەیداکەر دادەنێن ، وەبەیەکێك لەشتە پیسە دیارەکانی دادەنێن .بۆیە:

١- جیاوازی لەگەڵیاندا دروست بووە (الصدوق) دەگێڕێتەوە لە(علی بن اسباط) کەوتویەتی لە (رضا)م پرسی: جاری واهەیە·شتێك ڕودەدا من بەباشی سەری لێ دەرناکەم لەو شارەی منیشی تیادام کەس، دۆست ولایەنگرانی تۆی ،تیادانییە چی بکەم؟ پێی وت بچۆ بۆلای زانای ئەو شارەو پرسیارەکەتی لێ بکە ، جاهەرچۆن وەڵامی دایەوە تۆ پێچەوانەکەی وەربگرە چونکە ڕاستی لەوەدایە) عیون أخبار الرضا :١/٢٧٥، چاپی تاران.

(حسين بن خاليد) دەڵێ:(رضا) وتويەتی: ( دۆست ولايەنگرانی ئێمە ئەو کەسانەن کە مل کەچی فەرمانەکانی ئێمەن و بەقسەی ئێمە دەکەن وسەرپێچی دوژمنانمان دەکەن ،جاهەرکەس وانەبێ ئەوە لەئێمە نییە ) الفصول المهمة :٢٢٥، چاپی قم

(مفضل بن عمر) دەڵێ: (جعفر) وتويەتی:( درۆدەکات ئەو کەسەی خۆی بەدۆست ولايەنگری ئێمە دەزانێ بەڵام دەستی بەڕێبازی غەيری ئێمەوە گرتووە ) الفصول المهمة :٢٢٥

٢- دروست نييە کارێك بکرێت کە هاوڕێك بێت لەگەڵ کاری ئەواندا

ئەم سەرباسە (الحر العاملی) لە کتێبەکەيدا (وسائل الشيعة) کردوويەتييە سەرباسێك ودەڵێ : فەرمودەکان لەم بارەوە زۆرن پلەی تەواتوريان هەيە يەکێك لەوانە ئەو وتەيەی (الصادق)ە، خوالێی ڕازی بێ ،کەلەبارەی دو فەرمودەی جياواز بەيەك دەڵێ: ( بەرابەری پێ بکەن لەگەڵ هەواڵی عامە دا واتە(سوننە) جاهەرکات وەك هی ئەوان وابو ،وازی لێبهێنن و ،خۆئەگەر پێچەوانەی هەواڵی ئەوان بو وەری بگرن )

هەروەهادەڵێ :ئەگەر دو فەرمودەی جياوازتان پێ گەيشت ئەوەئەوەيان وەربگرن کە پێچەوانەی سوننەکانە ،هەروەها دەڵێ:( ئەوە بگرە کە پێچەوانەيە لەگەڵ عاممەدا) وە دەڵێ:( هەرچی پێچەوانەی عاممە کە بو ئەوا ڕێنويی تيادايە) وەدەڵێ سوێند بەخوا ئێوەلەسەر هيچ شتێك نين کەئەوان لەسەری بن وەئەوانيش هەروەها، بۆيە پێچەوانەيان بکەن ،بەڕاستی ئەوان بە هيچ جۆرێك لەسەر ڕاستی نين .

وەدەڵێ: سوێند بەخوا ،خواچاکەو باشەی نەداوە بەو کەسەی شوێن غەيری ئێمە دەکەوێ ،وەهەرکەس لەگەڵماندا بێت ئەوا سەرپێچی دوژمنانی ئێمەی

کردووه وه هەرکەسێکیش هاوڕابێت له قسه یا لەکردارێك لەگەڵ دوژمنەکانماندا ئەوه لەئێمه نییەو ئێمەش لەو نین

وه(العبد الصالح) خوالێی ڕازی بێت دەڵێ:(ئەو فەرمودەیه بگره که پێچەوانەی سوننەیەو ئەوەی لەگەڵ بۆچونی ئەواندا یەکی گرتەوه لێی دوریکەوەرەوه )

وه(رضا) دەڵێ: ( ئەگەردو هەواڵی دژ بەیەکتان پێگەیشت بڕوانن بزانن کامەیان پێچەوانەی عامەکەیه ،ئەوه ئەوەیان وەربگرن ،ئەوەی که هاوڕای ئەوانەوازی لێبهێنن

وه دەڵێ (سوێند بەخواهیچ شتێکی ڕاست ودروستیان بەدەستەوەنەماوه جگه له ڕوکردنه کەعبه نەبێ). بڕوانه: الفصول المهمة ص٣٢٢–٣٢٦.

پاشان (الحر العاملی) لەدوائەم هەواڵانه دەڵێ:ئەوەتا ئەم هەواڵانه لەپلەی تەواتوریش تێ پەڕیون سەیر لەوەیه کەهەندێك له زانا دواییینەکان پێیان وایه که ئەم بەڵگەیه (واته: سەرپێچی کارێك کەوەك هی سوننه کان وابێت و نادروستی ئەوکارەی هاوڕای کاری ئەوانه ) لێر ەدا هەواڵی تاکه

وەدەڵێ: بزانه ئەم هەواڵانه زۆربەی زۆری ئەو بنەما ئوصولیانه پوچەڵ دەکاتەوه کەله کتێبی عاممه کاندا هاتووه ) الفصول المهمة : ٣٢٦

٣–لەگەڵ سوننه کاندالەسەرهیچ شتێك هاوڕانین

سەید (نعمة الله الجزائری )دەڵێ: (ئێمه لەگەڵ سوننه کاندا لەسەر هیچ شتێك هاوڕاو کۆك نین نەلەبارەی خوا،نەلەبارەی پێغەمبەر نەلەبارەی هیچ پێشەوایەك چونکه ئەوان دەڵێن: پەروەردگاریان ئەو خوایەیه که محمد پێغەمبەریەتی و ئەبوبکریش جێ نشینی وەئێمه نەباوەڕمان بەو خوایه هەیەو

نەبەو پێغەمبەرە ،بەڵکو دەڵێین : ئەو خوایەی کە جێنشینی پێغەمبەرەکەی ئەبو بەکرە نەئەو خوایە خوامانە ونە ئەو پێغەمبەرەش پێغەمبەرمانە)[1]

الأنوار الجزائرية :٢/ ٢٧٨ ، باب: نور في حقيقة دين الامامية ، والعلة التي من أجلها يجب الأخذ بخلاف ماتقوله العامه

ئەم سەرباسەی سەرەوە (الصدوق) لە(علل الشرائع) دا کردویەتیە سەرباسێك و دواتر دەڵێ : (أبو ئیسحاق الإرجانی) ،دەڵێ: (أبو عبدالله) خوا لێی ڕازی بێت،پێی وتم : دەزانی بۆچی ئێوە فەرمانتان پێکراوە کە پێچەوانەی سوننە شت و ەربگرن؟ وتم :نازانین وتی:(عەلی) هەردینداریيەکی کردبێت ئیلا سوننە کان پێچەوانەی بون تا کارەکەی هەڵبوەشێتەوە ،دەچون پرسیاری ئەو شتەیان لە پێشەوای باوەڕداران ( خوالێی ڕازی بێت) دەکرد کە نەیان دەزانی جاکاتێ فتوای بۆ دەدان دەچون پێچەوانە کەیان دەکرد تاسەر لە خەڵکی بشێوێنن) :٥٣١چاپی ئێران

ئەم پرسیارانە دێنە پێشەوە

---

[1] بەلأم ئەوەی واقیع و بەبەرچاوەوەیە ،پێچەوانەی ئەو بۆچونەیە ،ئەویش ئەوەیە کە پەروەردگار خوای هەمو جیهانە و ،محمدیش (صل الله علیه وسلم) پێغەمبەریەتی و أبوبکریش جێنشینی بووە ، بەسەر هەمو نەتەوەی ئیسلام ئیتر جێ نشینایە تیە کەی شەرعی بێت یان نا بەڕاستی ئەو قسەیەی (الجزائری) زۆر ترسناکە چونکە واتای وایە: ئەگەر أبوبکر جێنشینی محمد بێت و محمدیش پێغەمبەری خوایە، ئەوا "سید الجزائری" نەباوەڕی بەو خوایە هەیە نە بەو پێغەمبەرەش واقعیش. سەلماندی کە أبوبکر جێنشینی "محمد" ە، جاشەرعی بێت یان نا هەتا من جارێکیان باسێکی هاوێنەی ئەمەم ئاڕاستەوخۆ لە "امام خوئی"پرسی ئەویش وتی هەرکەس قسەی وابکات بێباوەڕە بە خواو پێغەمبەرەکەی و ئەهلی بەیت سلاویان لەسەر

وادابنێین لەباسێکدا حەق بەلای سوننە کانەوە بێ ، ئایا پێویستە لەسەرمان کە پێچەوانەی وتەکەی ئەوان بگرین؟

جارێکیان(سید محمد باقر الصدر) وەلآمی دامەوە و ،پێی وتم: بەڵێ دەبێت پێچەوانەی بۆچونی ئەوان بگریت ،چونکە ئەم کارە ئەگەرچی هەڵەشە، هێشتا زۆر لەوە ئاسانترە کەهاورای بۆچونیان بین ئەمە ئەگەر وادابنێین ئەوان لەو باسەدا لەسەر حەقن

ڕق و کینی شیعە ئەوە نەبێ کەئەمڕۆ تازە هەبێ و تەنها تایبەتیش نییە بە سوننە کانی سەردەم بەڵکو ئەم ڕقە ئێجگار قوڵە کەدەگەڕێتەوە بۆنەوەکانی یەکەم ،مەبەستم سەحابەکانە کەڕقیان لە هەمویانە جگەلە سیانیان نە بێت ،ئەوانیش (أبوذر، مقداد، سلمان) (الكليني) لە(أبوجعفر ) دەگێڕێتەوە کەوتویەتی: لەپاش پێغەمبەر(صلی الله علیە و سلم) خەڵکەکە هەمو هەڵگەڕاوەن جگە لە سیانیان نەبێ ،مقداد بن الأسود، سلمان الفارسي، أبوذر الغفاري) روضة الكافي ج٨ص٢٤٦

ئەگەرلە جولەکەکان بپرسین ئایا لەنەتەوەی ئێوەدا ،باشترین کەستان کێیە ؟ دەڵێن:هاوەڵانی موسا.

وەئەگەر لە نەصاراکان بپرسین باشترین کەس لەنەتەوەی ئێوە کێیە؟

دەڵێن :حەوارییەکانی عیسا

وەئەگەرلە شیعەکان بپرسین بە بۆچونی ئێوە خراپترین کەس کێیە؟

دەڵێن: هاوەڵانی محمد (صلی الله علیه و سلم) هاوەڵانی پێغەمبەر لەهەموکەس زیاتر توشی جنێوو نەفرین و تانەی شیعەکان بونەتەوە بەتایبەت ، (أبوبکرو عومەروعوسمان و عائیشە وحفصە)، هەربۆیە لە پاڕانەوەی دو بتەکەی قورەیشدا هاتووە ( ئەی خوایە نەفرین بکە لە دو بتەکەی قورەیش ) واتە

(أبوبكر و عومەر) وە هەردو تاغوت و هەردو كچەكانیان عائیشەو،حفصە ...تاد) ئەم دوعایە بەدەق لە كتێبە باوەڕپێكراوەكانداهەیە وەئیمام (خومەینی) هەمو ڕۆژێك لە دوانوێژی بەیانیان دەیوت

(حەمزەی كوڕی محمد الطیار) دەڵێ:( محمدی كوڕی أبوبكر) ، لەلای (أبو عبدالله) خوا لێی ڕازی بێت،بوو، لەڕۆژێك لە ڕۆژان (محمدی كوڕی أبوبكر) بە پێشەوای باوەڕداران دەڵێ: دەستت بێنە با بەیعەتت بدەمێ ئەویش پێی دەڵێ بۆ مەگەر بەیعەتت نەداوە؟ (محمد)یش دەڵێ با ئیتر پێشەوای باوەڕداران دەستی دەهێنێ و (محمدی كوڕی أبوبكر) دەڵێ:شایەتی دەدەم كە تۆ ئەو پێشەوایەی كە گوێڕایەڵیت واجبە ، وە باوكم (واتە أبوبكر) لەئاگری دۆزەخدایە) رجال الكشی ص٦١

لە (شعیب) وە لە (أبو عبدالله) وە ڕەزای خوای لێبێت فەرمویەتی:هەر بنە ماڵەیەك لەخۆیان كەسێكی خانەدانی تێدایەو باشترین كەسێكی خانەدان كەلەبنەماڵەیەی خراپدا دروست بو بێت (محمدی كوڕی أبوبكر)ە رجال الكشی ص٦١

سەبارەت بە (عومەر) سید نعمة الله الجزائری دەڵێ

(عومەر) لەدواوە توشی نەخۆشییەك هاتبو ،كەبەهیچ جۆرێك هێورو دانە دەمركایەوە تەنهابە ئاو و شەهوەتی پیاوان نەبێت. الأنوار النعمانیة :٦٣/١

بزانە لەشاری (كاشان)ی ولاتی ئێران لەناوچەیەك كە پێی دەڵێن (باخی فین) جێگەیەك هەیە وەك شوێنی سەربازی ون بو لەوێدا گۆڕێكی خەیاڵی دروستكراوە كە گوایە ئەمە هی (أبو لؤلؤی فارسی)ئاگرپەرستە، ئەوكەسەی كەجێنشینی دووەم (عمر بن الخطاب)ی كوشت ؛:كەناوێكیان لێناوە بە عەرەبی واتاكەی ئاوایە :مرقد بابا شجاع الدین (گڵكۆی بابە شجاع الدین) ئەم ناوە

لەقەبی (أبو لؤلؤة ) یە چونکە (عمر بن الخطاب)ی کوشتووە جالەسەر دیواری ئەم شوێنە بە فارسی نوسراوە (مرگ بر أبوبکر،مرگ بر عمر ،مرگ بر عثمان) واتە:(مردن بۆ أبوبکر ،مردن بۆ عومەر،مردن بۆ عوسمان)

ئەم جێگەیە لەلایەن ئێرانییەکانەوە سەردان دەکرێت و خەڵکی دێن بۆزیارەتی و ماڵو بەخشین و جۆرەها سامانی تێدەخەن من ئەم جێگەیەم بەچاوی خۆم بینیوە ،وە (وەزارەتی ئیرشادی ئێرانی) هەستاوە بە فراوانکردن و نوێکردنەوەی و لەسەرو ئەمانەشەوە وێنەی ئەو جێگەیەیان خستۆتە سەر ئەوکارتانەی کەبۆ نامە و نوسین بەکاردەهێنرێت.

(الکلینی) لە(أبو جعفر)،خوالێی ڕازی بێت دەگێڕێتەوە کەوتویەتی: ........هەردو شەیخەین واتە(أبوبکر و عمر) بەبێ تەوبە لەدنیا دەرچون ،وەباسی ئەو شتانەی خۆیان نەکردووە کەبەرامبەر پێشەوای باوەڕداران کردبویان لەعنەتی خواو فریشتەکان وهەمو خەڵکیان لەسەر بێت. روضة الکافی :٨ /٢٤٦

سەبارەت بە عوسمان:

(علی بن یونس البیاضی) دەڵێ: ( عوسمان خەڵکی لە دواوە لەگەڵیا ڕایان دەبوارد ، وەکەسێکی سەرژنانی بو ) الصراط المستقیم :٢ /٣٠

دەربارەی عائیشەش:

(ابن رجب البرسی) دەڵێ (عائیشە) چل دیناری بە خیانەت وناپاکی کۆکردبۆوە مشارف أنوار الیقین ص٨٦

جامن دەپرسم :ئەگەر ئەم سێ جێ نشینە حاڵیان ئاوەها بوبێ ،بۆچی پێشەوای باوەڕداران خوالێی ڕازی بێت بەیعەتی دانێ؟ بۆچی بەدرێژایی

دەستەلاتی هەرسێکیان وەزیرو یارمەتی دەریان بو؟ئایا لێیان دەترسا ؟پەنابەخوالەشتی وا.

باشەئەگەر (عمر) لەدواوە توشی ئەو دەردە بوبێ کە ئاوی پیاوان نەبوایە دانەدەمرکایەوە وەك (نعمة الله الجزائری) دەڵێ ،باشە چۆن پێشەوای باوەڕداران (عەلی)خوا لێی ڕازی بێت (أم کلثوم ) ی کچی لێ مارەکرد؟ ئایە ئەم نەخۆشییە لە پێشەوای باوەڕداران پەنهان بو ئێستا (سید نعمة الله الجزائری) کەشفی کردووە ؟......، بەڕاستی ئەم بابەتە زۆر بیرکردنەوەی ناوێت

(الکلینی)دەگێڕێتەوە ( هەمو خەڵکی زۆڵن یالە ئافرەتی بەد ڕەوشت لەدایك بون ،جگە لەلایەنگرانی ئێمە نەبێ) روضة الکافی :۱۳٥/۸.

هەربۆیە شیعەکان خوێن وماڵی سوننە کانیان حەلاڵکردووە ،(داود بن فرقد) دەڵێ: بە(أبو عبد الله ) م وت: ڕەزای خوای لێبێت ،سەبارەت بەکوشتنی (ناصیبەکان) دەڵێ ی چی؟

وتی:(خوێنیان حەلاڵە ،بەلام ئاگادارت دەکەمەوە هەرکات توانیت دیوارێك بڕوخێنی بەسەر سوننییەکدا ،یا لەئاودا بیخنکێنی تا شایەتیت لەسەر نەدا ،بیکە) وسائل الشیعه ج۱۸ص٤٦۳ بحار الانوار ج۲۷ ص۲۳۱

ئیمام (خومەینی) لەسەر ئەم قسەیە بەم جۆرە دەڵێ: ( ئەگەر توانیت ماڵەکەی ببەیت بیبەو پێنج یەکی ماڵەکەی بۆ ئێمە بنێرە )

(سید نعمة الله الجزائری) دەڵێ (علی بن یقطین)، کە وەزیری (ڕەشید) بوو ،دەستەیەکی لەئەوانەی سەرپێچیان ،دەکرد لەزینداندا کۆکردەوەو فەرمانی دا سەقفی زیندانەکەیان بەسەردا ڕوخاندن و هەمویان مردن ژمارەیان پێنج سەد کەس دەبون الأنوار النعمانیة :۳ /۳۰۸.

کتێبەکانی مێژو باسی ئەو کاتەمان بۆ دەکەن ' کاتێ (هۆلاکۆ) چووە ناو بەغداد ەوە گەورەترین کوشت وبڕی ئەنجام دا بەجۆرێك جارێك ڕوباری دیجلە لەبەر خوێنی کوژراوانی سوننە کان سور ببو ، جارێك شین بو لەبەر زۆری ئەو هەمو کتێبەی خرایە ناو دیجلەوە هەمو ئەمانە بە هۆی دو وەزیرەکەوە بو (قصير الطوسی) و( محمد بن العلقمی) کە دو وەزیری خەلیفەی عەباسییەکان بون ،ئەم دوانە شیعەبون لەنێوان ئەمان وهۆلاکۆدا چەندین نامە گۆڕینەوەی نهێنی هەبو ،تاتوانیان (هۆلاکۆ) ڕازی بکەن بێتە ناو بەغدادەوە دەستەلآتی ئەو خەلافەتە بڕوخێنی کە ئەمان وەزیر بون تێیدا ئەگەرچی ئەمان دەستیان زۆر ئەڕۆیشت بەلآم بەو خەلافەتە ڕازی نەبون چونکە لەسەر پەیڕەوی ئەهلی سوننە بو ،هۆلاکۆ هاتە بەغدادو خەلافەتی عەباسی ڕوخاند ،ئیتر ئەوەندەی نەبرد ئەم دوانە بونە وەزیری هۆلاکۆ، مەعلومیشە کە (هۆلاکۆ)بت پەرست بو.

لەگەڵ ئەمەشدا کەچی، ئیمام (خومەینی) ئەو کارەی ئەو دوانە کردیان ،بەگەورەترین خزمەت بۆدینی ئیسلامی دادەنا و گەلێ لێی ڕازی بو

ئەم باسەش بەوتەیەکی گشتی وهەمەلایەن کۆتایی پێدێنم ئەویش وتەی (سید نعمة الله الجزائری)یە لەبارەی حوکمی(نواصب) سوننەکان وە دەڵێ:

(ئەوان کافرن پیس وگڵاون بەیەکدەنگی هەمو زانایانی شیعەی ئیمامی ، ئەوان لە جولەکەو گاور خراپترن یەکێك لە نیشانەکانی ئەمانە ئەوەیە ،لە پێشەوایەتیدا غەیری عەلی پێش بخات بەسەر عەلیدا) الأنوار النعمانية / ٢٠٦، ٢٠٧

بەم جۆرە دەبینین حوکمی شیعەکان بەسەر سوننەکاندا بە پوختی بەم جۆرەیە:

سوننەکان گلاّوو کافرو پیسن ،له جولەکەو گاور خراپترن ،نەوەی زۆل و بەد ڕەوشتەکانن کوشتنیان و بردنی ماڵیان پێویست ورەوایە لەهیچ شتێکدا لەگەڵیاندا یەك ناگرینەوە نەلە خوا نەلە پێغەمبەر نەلە پێشەوادا بەهیچ جۆرێك دروست نییە نەلە قسە نەلەکرداردا هاورِاییان بکرێت پێویستە نەفرین و جنێویان پێبدرێت بەتایبەت نەوەی یەکەم ئەوانەی کە خوا لەقورئاندا وەسفیان دەکا ئەوانەی شان بەشانی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) لەبانگەوازو جیهاددا لەگەڵیدا بون.،ئەگەر نا توخوا پێم بڵێ ئەوانەی کەلەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم)کەلە هەمو جەنگ و جیهادەکانیا لەگەڵیدا بەرامبەر بێباوەڕان بون کێ بون ؟بەشداری ئەوان لەو جەنگانەدا هەموی بەڵگەی ڕاستی باوەڕو جیهادیان دەردەخات بۆیە بە هیچ جۆرێك گوێ بەو قسانە مەدە کە زاناکانمان دەیکەن ،پاش کۆتایی هاتنی دەسەلاّتی بنە ماڵەی (پەهلەوی)یە کان وهاتنە پێشی شۆڕشی ئیسلامی و گرتنە دەستی کارەکان بەدەست ئیمام (خومەینی)یەوە ئیتر دەبو زانایانی شیعە بچن بۆ سەردان و پیرۆزبایی لێکردنی بەهۆی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەو دروست بونی یەکەم دەوڵەتی شیعەکان لەسەردەمی نوێدا کە فەقیە وزانایان حوکمی دەکەن جالە هەموکەس زیاتر پێویست بو لەسەرم کە بچم بۆلای بۆ پیرۆزبایی لەبەر ئەو پەیوەندییە بەهێزەی هەمبو لەگەڵیدا پاش مانگ و نیوێك

یا زیاترلە هاتنەوەی ئیمام بۆ (تاران) لە تاراوگە لە (پاریس) چوم بۆ ئێران کە چوم زۆر بە خێرهاتنی کردم من بە جیا لە نوێنەرانی زانایانی شیعەی عێراق سەردانم کرد لە دانیشتنێکی تایبەتدا پێی وتم: سەید (حسین) کاتی ئەوە هاتووە ئامۆژگارییەکانی پێشەوایان جێ بەجێ بکرێ،خوێنی نەواسیبەکان بڕێژین و منداڵەکانیان بکوژین و ئافرەتەکانیشیان ببەین بەتالاّنی ،کەسیان لە

سزا ڕزگاریان نەبێتو ماڵ و سامانیشیان تەنها بۆ لایەنگرانی ئەهلی بەیت بێت وە (مەککە) و (مەدینە) لەسەرڕوی زەوی نەهێڵین چونکە ئەم دوشارە بۆتە جێگەی وەهابیەکان وە پێویستە (کەربەلا) زەوی پیرۆزی خوا بێتە ڕوگەی نوێژی خەڵکی بەمە خەوی پێشەوایان، سلاَویان لەسەر، دێنینە دی ئەوا ئەو دەوڵەتەی کەچەندین ساڵە بۆی تێدەکۆشین دروست بو ئیتر تەنها جێ بەجێ کردنەکە ماوە.

تێبینییەك :

بزانە ڕق وکینی شیعەکان بۆ سونەکان بێ هاوتایە هەربۆیە زاناکانمان ڕێگەیان داوە درۆ بکرێ بەدەم سونەوە و درۆو بوختان بدرێتە پاڵیان وبەشتی خراپ وەسف بکرێن .

بەڕاستی ئێستا شیعە بەچاوێکی زۆر ڕقاوییەوە دەڕواننە سونەکان لەسەر ئەو فتواو ئاڕاستانەی کەلە سەرچاوە بەرزەکانەوە دەردەکرێت تەوجیهات وفتوا دەرچووە بۆ شیعەکان کە خۆیان بخزێننە ناو دام ودەزگاکانی دەوڵەتەوە و بەتایبەت ئەوانەی گرنگن وەك سوپاو ئاسایش و هەواڵگری و ئەو شوێنانەی کە گرنگن ئەمە جگە لە ڕیزەکانی حیزب.

هەمولایەك بە خۆڕاگرییەکی زۆرەوە چاوەڕێی کات ژمێری سفر دەکەن بۆبانگەشەی جیهادو لەناوبردنی سونەکان ،بەجۆرێك کە تەواوی شیعەکان وادەزانن بەم کارەیان خزمەتێك دەکەن بە (ئەهلی بەیت) سلاَویان لەسەر ئیتر نازانن ،ئەوانەی هانیاندەدەن لەپشتی پەردەوە کاردەکەن ، کەلەباسی داهاتودا ئاماژەی پێدەکەین

# شوێنەوار و لایەنی دەرەکی و بێگانە لە دروست کردنی بیری شیعەگەریدا

لەباسی یەکەمدا باسمان لەڕۆڵی( عبد الله بن سبأ) کرد لەدروست بوونی شیعەدا کەئەمەڕاستییەکەهەموشیعەخۆی لێ بێ ئاگا کردووە ،بەخوێندەوارو نەخوێندەوارەوە.

زۆرم بیر لەم باسەکردەوە بەدرێژایی چەندین ساڵ پاشان بۆم دەرکەوت هەروەك بۆکەسانی غەیری منیش دەرکەوت کە کەسانێك هەن ڕۆڵی ئێجگار زیان بەخشیان هەیە لەدروستکردنی چەندین بیرو باوەڕی پوچ و بیری خراپ ،لەبەرەو شیعەگەرێتی دا

مانەوەی من ئەم هەمو ماوەزۆرە لە حەوزەی عیلمی نەجەف کە بە پێشەنگی هەمو حەوزەکانی تر دادەنرێت ئاگاداربونم بەسەرچاوە گەورەکاندا وای لێکردم کەلەسەر چەندین ڕاستی ئێست و هەڵوێست وەربگرم کەزۆر ترسناکەو زۆرێك لێی بێ ئاگان یان خۆیانی لێ بێ ئاگا دەکەن چەندین کەسایەتی گومان لێکراو لەلام ئاشکرا بون کەڕۆڵی گەورەیان هەبو لەلادانی پەیرەوی شیعەدا تا گەیشتۆتە ئەمڕۆئەوەی خەڵکی "کوفە" لەبەرامبەر ئەهلی بەیت دا خوالێیان ڕازی بێت کردیان و ناپاکیان بەرامبەرکردن؛ وەك ڕابورد لە پێشەوە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسانەی ئاوهایان کرد کەسانێك بون خۆیان لە ژێر پەردەی شیعە گەری و دۆستایەتی کردن بۆ ئەهلی بەیت شاردبۆوە

باچەند نموونەیەك لەم بارەیەوە باس بکەین:

١_ (هشام بن الحكم) ،ئەم پیاوە کەلە (صحاح الثمانية) و شوێنی تر فەرمودەی هەیە

(هشام) بو کە بووە هۆی زیندانی کردنی ئیمام (کاظم)و پاشان کوشتنی لە کتێبی (رجال الکشی) دا هاتووە کە (هشام بن الحکم) گومڕاو سەر لێشێواوە ،بەشداری کردووە لە ڕژانی خوێنی (أبو الحسن) خوالێی ڕازی بێت )ص۲۲۹

(هشام)بە (أبو الحسن) ڕەزای خوای لێبێت دەڵێ: ( ئامۆژگاریم بکە ،ئەویش دەڵێ: ئامۆژگاریت دەکەم ،کەلە خوابترسە لە ڕشتنی خوێنم) رجال الکشی ص۲۲٦

جارێك (أبو الحسن) خوا لێی ڕازی بێت داوای لێدەکات قسەنەکات ئەویش مانگێك قسە ناکات ، پاشان دەگەڕێتەوەو (أبو الحسن ) پێی دەڵێ: ( ئەی هیشام پێت خۆشە ،بەشدار بیت لە ڕشتنی خوێنی کەسێکدا؟ دەڵێ :نەخێر ، پێی دەڵێ : ئەی دەڵێ ی چی ئەگەر بەشدار بی لە ڕشتنی خوێنی مندا ؟ئەگەر بێدەنگ بیت ئەوە چاکە گەرنا ئیتر کوشتنە ،ئیتر ئەوە بو هەر بێ دەنگ نەبو ،بەردەوام قسەی دەکرد تا ئەوە بو کە ڕویدا ) رجال الکشی ص ۲۳۱

دەکرێ پیاوێکی وا دڵسۆزبۆ ئەهلی بەیت بێتە هۆی کوشتنی ئەم پێشەوایە ،خوالێی ڕازی بێت !

لەگەڵمدا ئەم دەقانە بخوێنەرەوە

(محمد بن فرج الرخجی) دەڵێ: نامەیەکم نوسی بۆ (أبو الحسن ) خوالێی ڕازی بێت پرسیاری ئەوەم لێکرد کە (هشام بن الحکم) لە بارەی ئەو قسەیەی کە دەڵێ ،( خوا لاشەیە.)و ئەوەی کە (هشام بن سالم الجوالیقی ) ئەیڵێ کە گوایە خوا وێنەیە ، ئەویش بۆی نوسی وازبهێنە ،لەسەر سامی سەرسامەکان ،پەنا بگرە بە خوا لەشەیتانی دور لەسۆزی ڕەحمان ،ئەو قسەیە وانییە کە دەیڵێن هەردو هیشامان

أصول الكافی ج١/ ١٠٥ ،بحار الانوار ٢٨٨/٣، الفصول المهمة ص٥١.

(ابراهيم بن محمد الخزاز)و (محمد بن الحسن )، دەڵێن : چوینە ژورەوە بۆلای (أبـو الحسن رضـا) خـوالێی ڕازی بێـت ئـەوەی بـۆ گێڕاینـەوە کـە( محمـد) پەروەردگاری بینیوە ،لەسەر شێوەی لاوێکی تەمەن ٣٣ساڵ هەردوقاچی لـە نێـو سـەوزاییا بـووە ، وە پێمـان وت ( هـشام بـن الحكـم) و، (صـاحب الطـاق) (الميثمی) دەڵێن: خوا تـا نـاوکی بۆشـە ئـیتر ئـەوەی تـری بـێ گيانـە ...تـاد)

أصول الكافی ١/ ١٠١ بحار الانوار ٤٠/٤

ئایا ژیری ئەوە قبوڵ دەکا ت کە خوا لەسەر شێوەی لاوێکی تەمەن ٣٣ ساڵی دا بێ و تا ناوکی بۆش بێ ؟

بەڕاستی ئەم قسەیە ڕێك لە قسەی جولەکە دەچێت کە لـە تەوراتـدا لـە (سـفر التكوين) دا باس لە خوادەکـات کەبریتییە لەکەسێکی زەبەلاح ئەمـە بـە دەق باس کراوە لەتەوراتەکەیاندا

ئەمانە هەموی دەست و دروست کراوی جولەکەیە کەلەسەر دەستی (هشام بـن الحكم) هاتۆتە نێو بیری شیعەوە ئـەو کەسـەی کـە بـووە هۆکـارو هاوبـەش لـە کوژرانی ئیمام (کاظم) ،ڕەزای خوای لێبێت وەهـەروەها دەسـتی کەسـانی وەك (هشام بن سالم و شیطان الطاق و علی بن أسماعيل الميثمـی) ،خـاوەنی کتێبـی (الامامة) یە

خۆنەگـەر بـەناو کتێبـە متمانـەکانی خۆمانـدا بـڕوانین وەك کتێبـی ( الـصحاح الثمانية) و ئەوانی تر دەبینین فەرمودەکانی ئەمانە لە پێشی پێشەوەن .

٢-زرارة بن أعين

شێخ الطوسی دەڵێ: (زرار ) ،لەخێزانێکی گاور بووە باپیری ناوی (سنسن ) وتراویشە ناوی (سبسن) بووە ،ڕاهیبێکی گاور بووە باوکیشی کۆیلەیەکی ڕۆمی بووە کۆیلەی پیاوێك بووە لە خێڵی (شیبان) الفهرست ص١٠٤

(زرارە)ئەوکەسەیە کەدەڵێ: پرسیاری تەشەهودو تەحیاتم لە (أبو عبد الله) کرد .............تادەگاتە ئەوەی کە دەڵێ : کاتێ لەلای أبو عبد الله هاتە دەرەوە ،تڕێکم بۆ ڕیشی لێداو، وتم قەت ئەم کەسە سەرفراز نابێت ) ١ رجال الكشي ص٤٢

وە (زرارە) دەڵێ :سوێند بەخوا ئەگەر هەمو ئەوشتانەی کەلە (أبو عبد اللە)م بیستووە بیگێڕمەوە ئەوا زەکەری پیاوان هەڵدەستا لەسەر تەختەدار)٢ رجال الكشي ص١٢٢

(ابن سكان) دەڵێ: بیستم (زرارة) دەیوت: خوا ڕەحم بە (باوکی جعفر) بکا ،بەڵام (جعفر) خۆی ،بەڕاستی گرێیەك هەیە لەدڵما لەبەرامبەری ) پێم وت چی وا لە (زرارە) دەکات ،کە وابێ؟ وتی: ئەوەی وام لێدەکات ئەوەیە کە (أبو عبداللە ) هەمو ئەوشتانەی کە ببونە مایەی تەریقی (جعفر) باسکردبو. رجال الكشي ص١٣١

---

[1] کەسێك تڕ لێدا بەڕیشی (ابو عبداللە) دا خوالێی ڕازی بێت ،وەبڵێ: قەت سەرفرازنابێ بێگومان ئەو کەسە نابێ موسوڵمان بێ و دڵسۆزی ئەهلی بەیت بێت سلاویان لەسەر

[2] ئەمە تۆمەت بارکردنی (ابوعبداللە)یە مەبەست ئەوەیە کە (ابوعبداللە) شتی وەهای باسکردووە کە ئارەزوی پیاوان دەبزوێنێ بەجۆرێك لەکاتی بیستنیدا خۆیان ڕاناگیرێت وشەهوەتی خۆیان خاڵی دەکەنەوە ئەگەرلەسەرتەختەدارێکیش بێت.

هەربۆیە (أبو عبدالله) لەبارەی (زراره) وە دەڵێ (لعن الله زرارة) نەفرینی خوا لە (زرارة) رجال الكشي ص ١٣٣

( عبدالله ) خوا لێی ڕازی بێت ، دەڵێ: ئەی خوایە ئەگەر دۆزەخ بە ئەندازەی قاپێکیش بێت ئەوا بۆ بنەماڵەی (أعين بن سنسن) ی فراوان بکە رجال الكشي ١٣٣

هەروەها (أبوعبدالله) دەڵێ: نەفرینی خوالە (بريد) نەفرینی خوا لە(زرارة) رجال الكشي ص١٣٤

هەروەها دەڵێ: (زرارة) نامرێت ئیللا بە سەرگەردانی نە بێت نەفرینی خوای لێبێت رجال الكشي ص١٣٤

وەدەڵێ (زرارة بن أعين) سوێند بەخوالەو کەسانەیە کەخوالەبارەیانەوە ،دەفەرموێت: (وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا ) سورة الفرقان /٢٣ رجال الكشي ص١٣٦

ئێمەبەرەو کاری تاوانباران دەچین کە ئەنجامیان داوە ،وەك تۆز دەیبەین بەهەوادا.

وەدەڵێ: هەندێ کەس باوەڕ دەخوازن پاشان لێیان دەسەندرێتەوە ئەوانە لەدوارۆژداپێیان دەوترێت ( المعارون) ،وە(زراره بن أعين) یەکێکە لەو کەسانە رجال الكشي ص١٤١

وەدەڵێ : ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی مەکە ئەگەرمردن بەشداری تەرمەکەی مەکە پێی وترا(زرارة) ت مەبەستە؟

وتی: بەڵێ (زرارة) لە جولەکەو گاورخراپترە لەوکەسەش خراپترە ،کەدەڵێ سێ خواهەیەو خواسێهەمیانە ،بەڕاستی خوا زرارەی سەرەو خوار کردۆتەوە

(زرارة) گومانی لە پێشەوایەتی مندا هەیە ،بەڵام من بەخشیومە بە خوا[1].
رجال الكشي ص١٣٨

جانەگەر (زرارة) لەخێزانێکی گاوربوبێ و گومانی لە پێشەوایەتی (أبوعبدالله) دا هەبوبێ و ئەوکەسەش بوبێ کە تڕ بەریشی (أبوعبدالله)بکاو پێی وتبێ قەت سەرفراز نابێ ئیتر چی لە کەسێکی ئاوها چاوەڕوان دەکرێ کە پیشکەشی بکات بۆ ئیسلام ؟؟؟؟؟

کتێبی فەرمودەکانی ئێمە پڕ پڕن لەقسەکانی (زرارة)لەناو ڕاوییەکاندا لەپلەی پێشەوەیە ئەوکەسەی درۆ هەڵ دەبەستێت بەدەم ئەهلی بەیت وشتی وەهای خستۆتە ناو دین کە کەس نەیتوانیوە شتی وەها بکات وەك (أبو عبدالله) دەڵێ: هەرکەسێك بگەڕێتەوە سەر سەرچاوەکانمان بەڕاستی ئەم قسەیەی بۆ دەردەکەوێ ، هەروەها(بريد)یش کەهیچی کەم نەبووە لە (زرارة) ، هەتا (أبو عبدالله) خوالێی ڕزای بێت نەفرینی لە هەردوکیان کردووە

## ٣- (ابوبصير ليث بن البختري

(أبو البصير) ئەوکەسەیە کە بێ ئەدەبی کرد لەخزمەت (أبو الحسن موسى الكاظم ) خوالێی ڕازی بێت ، کاتێ پرسیار لە ئیمام موسى الكاظم کرا خوالێی

---

[1] بەگشتی سەرچاوەکانمان و وتەی زانایانمان دەڵێن قسەکانی (ابو عبدالله) بۆ (زرارة) چاوبەست بووە بەڵام ئەمە بەڕاستی بێ بنەمایە ، دەی ئەگەر قسەکانی (أبوعبدالله) بۆچاوبەست بوبێ ئەی قسەو توانجەکانی (زرارة) لە أبوعبدالله چی دەگەیەنێت ؟.

نەخێر بەڕاستی ئەمە ئەوە دەردەخات کەناکۆکی و دابڕانێك لە نێوان (ابوعبدالله) و (زرارة) دا هەبوە ئەویش بەهۆی ئەوڕەفتارو قسەو کردارە ناشایستانەی کە دەیکرد ئەگەر نا (ابوعبدالله)ئەوقسانەی پێ نەدەوت

ڕازی بێت ، لەبارەی پیاوێکەوە ئافرەتێك بخوازێت کەئەو ئافرەتە لە هەمان کاتدا مێردی تری هەبێ چی لەسەر ئافرەتەکەیە؟ بەڵام پیاوەکە نەزانێ ئافرەتەکە مێردی تری هەیە (أبو الحسن ) دەڵێ: دەبێ ژنەکە بەرد باران بکرێ بەڵام ئەگەرپیاوەکە نەیزانی مێردی تری نییە هیچی لەسەر نییە ، ئیتر (أبو البصیر) دەکێشێ بەسەر سنگی (أبو الحسن ) دا بەجۆرێك کەشوێنەواری پیاکێشانەکە لەسەرسنگی دەردەکەوێت وبە (أبو الحسن ) دەڵێ: پێم وایە هێشتا هاوڕێکەمان زانستی تەواو نییە رجال الکشي ص١٥٤

واتە:( ئیمام کاظم) خوالێی ڕازی بێت تاوانباردەکات بەوەی کە زانستی کەمە تا جارێکیان (أبو بصیر ) و(إبن أبو العیفور ) لەبارەی دنیاوە قسە دەکەن (أبو بصیر) دەڵێ هاوەڵەکەتان مەبەستی (أبو الحسن )ە کە ئەگەر دنیای چنگ بکەوتایە ئەوا دنیای هەڵدەبژارد و ، پاشان (أبو بصیر) لەهۆش خۆی دەچێ ، سەگێك دێت دەیەوێت میزبکات بە (أبو بصیر) دا ،(حماد بن عثمان ) دەچێ بۆ ئەوەی دەری بکات بەڵام ( ابن ابو الیعفور ) دەڵێ :وازی لێ بێنە ئیتر سەگەکە دێت و میزدەکاتە ناو هەردو گوێی (أبو بصیر)ەوە رجال الکشي ص١٥٤ واتای ئەم قسەیەی ئەوە دەگەیەنێت کە ( أبو عبدالله) حەزی لە دنیا کردووە و باوی دنیای داوە بەسەر دواڕۆژدا ، بەڵام خوا تۆڵەی لێ سەندەوە بەوەی کەسەگێکی نارد میزی کردە هەردو گوێ یەوە ، لەبەرامبەر ئەو قسانەی کە بە (أبو عبدالله) ی وتبو

(حماد بن الناب) دەڵێ : جارێك ( أبو بصیر) لەبەر دەرگای ، ماڵی ( أبو عبد الله) دانیشت ، تامۆڵەتی بدا بەڵام (أبو عبد الله) مۆڵەتی نەدا ، (أبو بصیر)یش دەڵێ ئەگەر سینییەك خواردنمان پێبوایە مۆڵەتی دەداین بچینە ژورەوە . ئیتر سەگێك دێت ،هەڵدەزنێ و میز دەکات بەدەموچاوی (أبو

بصیر)دا ، (أبوبصیر)یش دەڵێ ئۆف ئۆف ئەوە چی یە ؟(أبو بصیر) پیاوێکی کوێربووەو چاوی نەی بیناوە جائەوەی تەنیشتیەوە پێی دەڵێ ئەوە سەگێکە میزی کرد بە دەموچاوتا رجال الکشی ص١٥٥.

لەم قسەیەشدا دەردەکەوێ کە (أبو عبدالله) تاوانباردەکات بەوەی کەحەزی لە خواردنی خۆشە ، بەجۆرێ کە هەرکەس سینییەك خواردنی پێنەبێ ماوەی نادات بچێتە ژورەوە ، بەلاّم خوای گەورە سزای (أبوبصیر ) ی داو سەگێکی نارد تامیز بکات بە دەمو چاویدا

(أبوبصیر) کەسێك بووە لەبارەی ڕەوشتەوە متمانەی بە خۆی نەبووە ئەوەتا خۆی شایەتی لەسەر خۆی دەدات و،دەڵێ: من ئافرەتێکم فێری قورئان دەکرد کەمێك سوعبەتیشم لەگەڵ دەکرد وە دەڵێ: ئەو ئافرەتە هات بۆلای (أبو جعفر) شکاتی کرد ، (أبوجعفر)یش پێی وتم (أبو بصیر) چیت بەوئافرەتە وتووە ؟ وتم دەستم هێناوە ......، ودەموچاوی دەشارێتەوە ،(أبوجعفر) یش بەئافرەتەکە دەڵێ مەچۆرەوە بەلایدا رجال الکشی ص١٥٤

(أبوبصیر) بەمەبەستی یاری وگاڵتە دەستی بردووە بۆ چەند جێگەیەکی جەستەی ئافرەتەکە لەکاتێکدا کە قورئانی فێر کردووە (أبوبصیر) کەسێك بووە شتی تێکەڵ و پێکەڵ کردووە

محمد بن مسعود دەڵێ لەبارەی (أبو بصیر)ەوە پرسیارم لە ( علی بن حسن ) کرد ، ئەویش وتی: (أبو بصیر) کەسناو (کنیة)کەی ،(أبو محمد) ە ئازادکراوی (بنی أسد) ، ،کابرایەکی کوێربووە ، پرسیم تۆمەت بارە بەوەی کە ڕۆچوبێ و زیادەڕەوی هەبوبێ ؟ وتی نەخێر ، بەلاّم کەسێك بووە تێکەڵ و پێکەڵی هەبووە رجال الکشی ص١٥٤.

دەی ئەم کەسە لە فەرمودەکاندا فەرمودەی زۆرە ،سەیر لەوەیە کەسێك ئاوا شت تێکەڵ بکات ئیتر ئەبێت چ تێکەڵییەك بکاتە نێو دینەوە ؟

٤- زاناکانی طەبەرستان:

لە(طبرستان) دەستەیەك سەریان هەڵدا بەناو شارەزا لەزانست دا بەلأم ئەوانە لەو جۆرە کەسانە بون کەدزەیانکردبووە ناو شیعەوە ، بەمەبەستی خراپەکاری و تێکدان گومان لەوەدانییە ، کەئەوەی شایەتی لەسەرخۆدی مرۆڤ دەدا کارو کردەوەکانییەتی ، جانەگەر چاکەو باشەی لەپاش بەجێما ئەوە بەڵگەیە لەسەر هەڵسوکەوت و ڕەوشت جوانی و بیروباوەڕی چاکی وکاتی پەنهانی ئەوکەسە ،دیارە پێچەوانەکەشی بەڵگەیە لەسەر خراپی ،هەڵسوکەوت جا لەڕەوشت دا بێ یاله بیرو باوەڕ، بەڵگەشە لەسەر خراپی ناوەوەو کارە پەنهانەکانی

هەندێ لەزاناکانی طبرستان چەند کارێکیان لەپاش بەجێ ماوە کەبەڕاستی گومان ودودڵی لە کەسایەتیاندا دروست دەکات ،ئێمە تەنها سیان لەو کەسانەی کە زۆربەناوبانگن باس دەکەین ،کەلە (طبرستان) دا هەڵکەوتون

١- ( میرزا حسین بن تقی النوری الطبرسی) خاوەنی کتێبی ( فصل الخطاب فی إثبات تحریف کتاب رب ألأرباب ) لەم کتێبەدا ، زیاد لە (دوهەزار) گێڕانەوەی لە کتێبەکانی شیعەوە هێناوە و لەو کتێبەدا داناوە کەگوایە ئەمانە هەموی باس لە تێکدان و دەست کاری کردنی قورئان دەردەخەن وە وتەو قسەی زاناو موجتەهیدەکانی تیادا کۆکردۆتەوە کەبەڕاستی ئەم کتێبە خاڵ و نیشانەیەکی شەرمەزاری یە بەناوچاوانی هەمو شیعەیەکەوە ، جولەکەو گاورەکان دەڵێن: قورئان دەست کاری و گۆڕانی تیداکراوە جادەبێ جیاوازی قسەی نێوان ئەوان و (طبرسی) چی بێ؟ ئایە کەسێك خۆی بە موسوڵمان بزانێ

و شایەتی بدات کە قورئان خواناردویەتی و خۆشی پەیمانی پاراستنی داوە دەگونجێ شایەتی بدا کە قورئان گۆڕاوەو دەستکاری تێدا کراوە ؟؟؟؟

٢-(احمد بن علی بن ابی طالب الطبرسی)[1] خاوەنی کتێبی(الاحتجاج ) لەم کتێبەدا چەندین گێڕانەوەی هێناوە لەسەر دەستکاری کردنی قورئان هەروەها باسی پەیوەندی نێوان پێشەوای باوەڕداران (علی)و هاوەلاّن کەزۆرپەیوەندیان خراپ بووە وە ئەم گێڕانەوانەش بووە هۆی لێکترازانی یەکپارچەیی موسولّمانان وە هەرکەس ئەم کتێبە بخوێنێتەوە دەزانێ کەدانەرەکەی مەبەستی پاك نەبووە.

٣-( فضل بن الحسن الطبرسی ) خاوەنی کتێبی (مجمع البیان فی تفسیر القرآن)ئەوتەفسیرەی کەپڕ پڕە لە هەڵەو لێکدانەوەی نادروست و ڕاڤەی ئەوەندە بێ واتا کەلەگەڵ سادەترین یاساکانی تەفسیردا یەکناگرێتەوە.

بەڕاستی ناوچەی (طەبەرستان)و ئەو ناوچانەی دەوروبەری پڕە لە جولەکەی (خەزەر)ئەم طەبەرستانیانە جولەکەن و لەژێر پەردەی ئیسلامدا خۆیان حەشارداوە کتێبەکانیان یەکێکە لەگەورەترین ئەو کتێبانەی کەتانە لەدینی ئیسلام دەدا بەجۆرێك ئەگەر بەراورد بکەین لەنێوان کتێبی (فصل الخطاب) ودانراوی ڕۆژهەلاّت ناسەکان ئەوانەی کەتانەیان داوە لەئیسلام دەبینین کتێبی ( فصل الخطاب) لەدانراوەکانی ئەو ڕۆژهەلاّتناسانە خراپتر تانەی داوە

---

[1] بۆیە ئەم ناوەی لەخۆی ناوە تابتوانێ زیاتر ژەهر و نیازەخراپەکانی بلاّو بکاتەوە ، ئەگەرنا کەسی وا شیاوی ئەو جۆرە ناوە نییە، کە خۆی بچوێنێ بە پێشەوای باوەڕداران ،مەعلومە ئەم کەسە بنەچەی نەزانراوەو کەس لەژیانی ئاگادار نییە

لەئیسلام بەهەمان شێوە دانراوی ئەوانی تریش هەروەها. جارێك یەكێك لەمامۆستاكانی حەوزەی شاری نەجەف مرد منیش لەبەر خوا لاشەكەیم شۆری هەندێ لەمندالەكانیشی لە شۆردنەكەیدا یارمەتیان دام لەكاتی شۆردنەكەیدا بینیم كە ئەوكەسە خەتەنە نەكراوە. ئێستا ناتوانم ناوەكەیتان بۆ باس بكەم چونكە مندالەكانی دەزانن كێ باوكیانی شۆردووە چونكە ئەگەر ناوەكەی بلێم دەمناسن ودەشزانن من دانەری ئەم كتێبەم وكارەكەم ئاشكرا دەبێت وكارێك ڕودەدا كە داهاتووە كەی چاك نابێت لێرە لە حەوزە چەندین بەڕێزو كەس هەن كەچەندین تێبینیم هەیە لەسەریان كەبۆتە مایەی گومان بۆم لەبەرامبەریان وەسوپاس بۆ خوا من یەكێكم لەوانەی كە بەدواشت دا دەچم تا دلنیاببم لە ڕاستییەكەی .بابێین لایەنێكی تر لەدەستی بێگانە بخەینە ڕو لەناو شیعەدا ئەم كەسانە هاتون دەستكاری كتێبە. متمانە پێكراوەكان و سەرچاوە گرنگەكانی ئێمەیان كردووە باچەند نمونەیەك بهێنین ، تا خوێنەر بزانێ كەچی كراوە

كتێبی ( الكافی) بەیەكێك لەگەورەترین سەرچاوەكانی شیعە دادەنرێ ئەو كتێبەیە كە گوایە لەلایەن پێشەوای دوانزەهەمەوە متمانەی پێدراوە گوایە كاتێك ( الكلینی) ئەو كتێبە دادەنێ پیشانی پێشەوای دوانزەهەمی دەدا لەناو زێرابەكەی خۆیدا لەسامەڕا ، پێشەوای دوانزەهەمیش پێی دەڵێ: ( الكافی كاف لشیعتنا) بەڕاستی كتێبی(كافی) بەسەبۆ دۆستان ولایەنگرانمان بڕوانە /پێشەكی (الكافی)ص٢٥

(سید عباس القمی ) دەڵێ: كتێبی (الكافی) پیرۆزترین كتێبە لەناو كتێبە ئیسلامییەكاندا وەگەورەترین دانراوی ئیمامییەكانە ، ئەو كتێبەیە كە كتێبی وا بۆ ئیمامیەكان دانەنراوە بە هیچ جۆرێك

(محمد أمين الاسترابادی) دەڵێ: بیستومانە لە مامۆستاکانمانەوە کە لە ئیسلامدا هیچ کتێبێك دانەنراوە کە هاوتاو هاوشانی کتێبی (الکافی ) بێت. الکنی والالقاب ج٣ص٩٨.

بەڵام وەرە ئەم وتانە لەگەڵ مندا بخوێنەرەوە

(خوانساری) دەڵێ: ڕاجیایی هەیە لە کتێبی (الروضة) کەچەندین باسی لە خۆگرتووە کە ئایا یەکێکەلە کتێبەکانی (کافی) کەدانراوەکەی (الکلینی) یە یالەوەو دوا لێی زیادکراوە روضات الجنات٦/١١٨

مامۆستای باوەڕپێکراو ،(سیدحسین بن السید حیدر الکرکی العاملی) کەساڵی (١٠٧٦ك)مردووە ،دەڵێ :کتێبی (الکافی )پەنجا باسە بەهەمو ئەو شتانەی کەتیایدایە ،بۆ هەر فەرمودەیەکی پەیوەست بە پێشەوایانەوە سڵاویان لەسەر روضات الجنات٦/١١٤

بەڵام (سید أبو جعفر الطوسی )کەساڵی ٤٦٠ك مردووە ، دەڵێ :کتێبی (الکافی) (سی) باس لە خۆ دەگرێت الفهرست ص١٦١.

لەو وتانەی کە ڕابورد دەرکەوت کەئەوەی لەسەر (الکافی) زیادکراوە لەنێوان سەدەی (پێنج) و سەدەی (یانزدە) ،بیست کتێبە هەرکتێبەی چەندین باس و بابەتی زۆر لەخۆ دەگرێت ، واتە ڕێژەی ئەوەی زیادکراوە لە کتێبی (الکافی) بەدرێژایی ئەم ماوەیە ،٤٠٪ ،ئەمە جگە لەگۆڕانی گێڕانەوەکان و دەستکاری کردنی وشەکانی و لابردنی چەندین برگەو زیادکردنی چەندانی تر بۆی ،جا ئەوە کێ بووە کە بیست کتێبی لە(الکافی )زیادکردووە؟ دەکرێ ئەو مرۆڤەی ئەوەی کردووە پاك وچاك بێت ؟؟؟!!!.

ئایا ئەم کارە بەکەسێك کراوە؟ یابەچەندین کەسایەتی زۆر کەبەدرێژایی ئەم سەدە دورو درێژانە خەریکی زیادکردن وگۆڕان ودەستکاری کردنی بون ؟؟!!

دەپرسین: ئایا کتێبی ( الکافی) متمانەدار ماوەتـەوە لەلایـەن ئـەو پێشەوایەی کە نەهەڵە دەکات نەشتی لێ تێك دەچێت ؟؟!!

بـابێین کتێبێکـی تـر بـاس بکـەین کەبـە دووەم کتێـب دێـت لـەدوای کتێبـی (الکافی)ئەویش کتێبی(تهذیب الاحکام) ە کە هی شێخ (الطوسـی) دامەزرێنـەری (حـەوزەی نەجـەف)ە ئـەم کتێبـە یەکێکـە لـەو چـوارکتێبەی کەناسـراون بـە (الـصحاح الأربعـة الاولی)؛زاناوشـارەزاکانمان دەڵـێن: (١٣٥٩٠)فـەرمودەی لەخۆگرتووە ،بەڵام (طوسی)خۆی کەدانەری کتێبەکەیە بـاس لـەوە دەکـات کـە (تهذیب الأحکام)زیادلە (٥,٠٠٠)فەرمودەیە واتە هەرچۆن بێت ناگاتـە (شـەش هەزار) فەرمودە جادەبێ کـێ بێـت ئـەو ژمـارە فـەرمودە زۆرەی بـۆ زیـادکردبێ کەلەژمارەی ئەصڵی کتێبەکە فەرمودەی بۆ زیادکراوە؟

ئەمەجگە لـەو هەموشـتە ناشیاوانەی کەلـە هـەردو کتێبـی (الکـافی) و(تهـذیب الاحکام ) و کتێبەکانی تردا گێڕدراونەتەوە ، بێگومان ئەمە دەستێکی شاراوەو نهێنییە لەژ ێرپەردەی ئیسلامدا ئەم شتانەیان زیـاد کـردووەو ئیـسلامیش لـەم شتانە دورە ، دەی ئەمە ئەگـەر حـاڵی گـەورەترین دوکتێـب بێـت ، ئـەی دەبـێ سەرچـاوەکانی تـر چـۆن بـن وچـی تێـدا ببیـنین ؟ بۆیـە (سـید هاشـم معروف الحسینی) دەڵـێ: چـیرۆك گێڕەرەوەکـانی شـیعە لەگـەڵ دوژمنـانی پێـشەوایان ژمارەیەکی ئێجگار زۆریـان لـەم جـۆرە دانـاوە بـەناوی پێـشەوایانەوە هـەروەها دەڵـێ :لـەپاش بـەدوادا چـونێکی زۆر بـەنێو ئـەو فەرمودانـەی کەلـە کتێبـی فـەرمودەدا هـەن وەك (الکـافی) و(الـوافی) ،و.ئەوانی تـردا دەبیـنین کـە تونـد ڕەوەکان وداخ لەدڵان بەرامبەر پێشەواو خواناسەکان لـە هەرباسـێك لـەباس و بابەتەکاندا دزەیان کردۆتە ناو ئەو دانراوانەو چەندین شتیان بەناوی ئەوانەوە

دروست کردووە تا وتەو فەرمودەکانی ئەوان خراپ بکەن و کەسایەتیان بشێوێنن ) الموضوعات ص١٦٥-٥٣.

وەبێ پێچ وپەنا ، (شیخ الطوسی) ، لە پێشەکی ( التهذیب ) دا دانی بەمەداناوە و دەڵێ لەگەڵ هەندێ لە دۆستان لەبارەی فەرمودەی زاناکانمانەوە گفتوگۆمان دەکرد و ئاڵو گۆڕی فەرمودەکانیانمان دەکرد و ئەو جیاوازی و دژایەتییەی لە نێوان فەر مودەکاندا هەیە کە زۆربەی کات هەرفەرمودەیەك دەگریت لەبەرامبەریدا فەرمودەیەکی دژ بە ئەو هەیە هیچ فەرمو دەیەك بەساغی دەرناچێت ئیللا لەبەرامبەریدا شتێك هەیە دژیەتی هەتا وای لەو کەسانەکردووە کە پێچەوانەی ئێمەن ، گەورەترین تانە لە بیرو بۆچونمان بدەن. ئەگەرچی ( الطوسی) زۆر سوربووە لەسەر ئەوەی کتێبەکەی پارێزراو بێت بەڵام وەك دەبینی ڕوبەڕوی گۆڕان ودەستکاری کردن بۆتەوە لەسەردانەکەمدا بۆ وڵاتی (هندستان) چاوم بە(سەید دڵدار علی) کەوت ئەویش نوسخەیەکی لە کتێبەکەی خۆی پێشکەش کردم ، بەناوی ( أساس الاصول) ،لەلاپەڕە ( ٥١) داهاتووە کە دەڵێ ئەو فەرمودانەی لە پێشەواکانەوە هاتووە زۆر جیاوازن ، بەجۆرێ زۆر دور نییە کە هەر فەرمودەیەك هەبێ لە بەرامبەریدا شتێك هەیە کەدژیەتی ، هیچ هەواڵێك نییە ئیللا لە تەنیشتیەوە پێچەوانەکەی هەیە. ئائەم هۆکارەیە کەپاڵی بەزۆرێکەوە ناوە واز لەمەزهەبی شیعە بهێنن .

جاباسەیری ئەو وتەیە بکەین کەدەڵێ: قورئان دەست کاری کراوە ، یەکەم کتێب کە دەق دەنێ بەم باسەدا کتێبەکەی (سلیم بن قیس الهلالی) یە کە ساڵی (٩٠) ك مردووە تەنها دو ڕیوایەت دەهێنێ ، وە ئەمە یەکەم کتێبی شیعەکان بو کەسەری هەڵدا ، جگەلەم دو ڕیوایەتە هیچ ڕیوایە تێکی تری تێدانییە. بەڵام

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبە باوەڕ پێکراوەکانمان و ئەو کتێبانەی لە پاش (سلیم بن قیس) بەچەند سەدەیەك نوسراون ئەوە پڕە لە ڕیوایەت کەباس لە گۆڕانی قورئان دەکات ، هەتا وای لە (النوری الطبرسي) کردووە کەبتوانێ لە کتێبەکەیدا بەناوی (فصل الخطاب) زیاد لە (دوهەزار) گێڕانەوەی تێدا کۆ بکاتەوە . جا دەپرسین: کێ ئەم ڕیوایەتانەی داناوە ؟ بەتایبەت ئەگەر بچینەوە سەرئەوەی کە ئێستا باسمان کرد ، لە زیادکردن بۆ چەندین کتێب بەتایبەت ئەوانەی ناسراون بە ( الصحاح) دەرئەکەوێ کە ئەم ڕیوایەتانە زۆر لە دوا کتێبەکەی ( سلیم بن قیس) دانراون لەوانەیە لە شەشی کۆچی یا حەوت دابوبێت هەتا (الصدوق) کە لە ساڵی (٣٨١) ك.دا مردووە دەڵێ: ( ئەوەی ئەو قسەیە بخاتە پاڵ شیعە کە گوایە دەڵێن ، قورئان دەستکاری کراوە ،ئەوە درۆزنەو درۆی کردووە لەبەرئەوەی ئەم جۆرە ڕیوایەتانە نەبیستراون چونکە ئەگەر بیسترابونایە ئەوا دەزانرا و، دەبیسترا . تەنانەت (الطوسی) دانانی ئەم کارە بۆ پاڵ شیعە نکۆڵی دەکات وەك لەتەفسیری ( التبیان فی تفسیر القران) چاپی (النجف)ساڵی (١٣٨٣ ك) داهاتووە،کتێبەکەی (سلیم بن قیس)یش ئەوکتێبەبەناوی ئەوەوە،هەڵبەستراوە و (أبان بن أبی عیاش ) داینـاوە دواتر داویەتیە پاڵ(سلیم) .لەبارەی (أبان ) ،(ابن مطهر الحلی) و( الاردبیلی ) دەڵێن: کەسێکی زۆر لاوازە زاناکانمان کتێبەکەی کە بەناوی ( سلیم بن قیس ) وەیە دەیدەنە پاڵ ئەو. بڕوانە/ الحلی ص٢٠٦ ، جامع الرواة ، الاردبیلی ٩/١.

کاتێ کە دەوڵەتی سەفەوییەکان هاتە ئاراوە ، پانتاییەکی فراوان ڕەخسا بۆ هەڵبەستنی چەندین ڕیوایەت ودانەپاڵی بۆلای (امام صادق) وکەسانی تر لە پێشەوایان سلاویان لەسەر .لەپاش ئەم کورتەیە ، بۆمان ڕون دەبێتەوە ، کەدانراوی زاناکانمان ،متمانەی پێناکرێ و ناکرێ پشتی پێ ببەسترێت ،

چونکە بایەخ وگرنگی و چاودێری نەکراوە ،هەربۆیە دەستی دوژمن کاری گەیشتوتێ و ئەوەی پێکردووە کەدەزانی ، ئێستاش دەمانەوێ بچینە سەر جۆرێکی تر لە شوێنەوارەکانی دەستی بێگانە ،لەناو شیعەدا.

ئەویش باسی پێشەوای دوانزەهەمە کەباسێکی ئێجگار ترسناکە . بەڕاستی برای بەڕێزمان (سیدأحمد الکاتب) زۆربەجوانی باسی لەم بابەتە کردووە و، رونی کردۆتەوەکە پێشەوای دوانزەهەم هیچ راستییەکی نییەو ئەوکەسایەتییە بونی نییە ، بەڕاستی (سیدأحمد الکاتب) ئەم باسەی لەکۆڵ ئێمەکردۆتەوە . بەڵام ئەوەندەهەیە من دەڵێم ئاخر دەبێ چ بونێکی هەبێت لەکاتێکدا کتێبە باوەڕپێکراوەکانمان باس لەوە دەکەن کە( حسن العسکری) پێشەوای یانزەهەم ، کەمردووە هیچ کوڕێکی نەبووە ، وەلەکاتی مردنیشیدا سەیری هەمو خێزان و کەنیزەکەکانی کراوە ، کەسیان سکپڕنەبون و خاوەن منداڵ نەبون .بڕوانە کتێبی/الغیبة للطوسی ص٧٤؛ الارشاد للمفید ص٣٥٤؛ أعلام الوری للفضل الطبرسی ص٣٨٠ المقالات والفرق للأشعری القمی ص١٠٢.

بەڕاستی برای بەڕێزمان(سیدأحمد الکاتب) زۆربەچاکی لێکۆڵینەوەی کردووە لەبارەی ئەوانەی خۆیان بە نوێنەری پێشەوای دوانزەهەم دەزانن وە ئەوەی یەکلاکردۆتەوە کە ئەوانە کەسانێکی درۆزن وفێڵبازن بۆدەستگرتن بەسەر ماڵ و دارایی پێنجیەك و ئەو بەخشش و دیارییانەی دەخرێنە نێو مەرقەدو زێرابەکەوە ، ئەمەدەکەن.

باسەیر بکەین بزانین پێشەوای دوانزەهەمین کە دێت کەناسراوە بە (القائم) یا (المنتظر) چی دەکات:

١- شمشێر دەخاتە ناو عەرەبەوە

(المجلسی) دەگێڕێتەوە کە مەهدی چاوەڕوانکراو ( المنتظر) بەناو عەرەبدا دەڕوات و ئەوکارە دەکات لە نێو ( الجفر الاحمر)[1] داهەیە کە بریتییە لە کوشتنی عەرەب بحار الانوار ٣١٨/٥٢.

هەروەها دەگێڕێتەوە : لە نێوان ئێمەو عەرەبدا هیچ شتێك نەماوەتەوە تەنها سەربڕین نەبێت. بحار الانوار ٣٤٩/٥٢.

هەروەها دەگێڕێتەوە لە عەرەب خۆت بپارێزە چونکە هەواڵی خراپیان هەیە ئەوان هیچ یەکێکیان لەگەڵ (القائم) دا (مەبەست مهدی یە) نایەنە دەرەوە بحار الانوار ٣٣٣/٥٢

منیش دەڵێم باشە ئەگەر زۆربەی شیعە ئەصل و بنەچەیان عەرەب بێت ئایە دەگونجێت مەهدی شمشێریان ، لێ ڕابکێشی و ، سەریان ببڕێت؟؟

نەخێر..........نەخێر بەڕاستی لە پشت ئەم ڕیوایەتانەوە کەسانێك هەن کە ڕۆڵێکی ئێجگار خراپیان هەیە ، لە بلاو کردنەوەی ئەم جۆرە ژەهرانە ، سەیر نەبێ بەلاتەوە کە (کیسرا) لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێت ، ئەوەتا (المجلسی ) لە پێشەوای باوەڕدارانەوە دەگێڕێتەوە ، کە وتویەتی: خوا ، (کیسرا) لە دۆزەخ ڕزگار دەکات و ، دۆزەخ لەسەر کیسرا حەرام دەکات بحار الانوار ٤/٤١

ئایا بەژیری کێدا دەچێ ، کە پێشەوای باوەڕداران (علی) سلاوی لەسەر کە بلێ خوا (کیسرا) لەدۆزەخ ڕزگار دەکات و،دۆزەخی لەسەر حەرام دەکات؟

٢-ڕوخاندنی مزگەوتی (کەعبە) و(مزگەوتی پێغەمبەر) (صلی الله علیه وسلم)

---

[1] لەباسی پەڕاوە ئاسمانییەکاندا باسی ( الجفر الاحمر) کراوە بگەڕێرەوە سەری

(المجلسي) دەگێڕێتەوە: (مەهدی چاوەڕوانکراو) مزگەوتی پێغەمبەرو مزگەوتی کەعبە تێك دەدات و ، دەیان ڕوخێنێ تاسەربناغەکەیان. بحار الانوار ٣٣٨/٥٢، الغيبة للطوسي ص٢٨٢

وە (المجليسي ) ئەوە ڕون دەکاتەوە کە : یەکەم شت کە مهدی چاوە ڕوانکراو دەیکات ئەوەیە کە (أبوبکر و عومەر ) لەگۆڕەکانیان دەردەهێنێ و دەیاندا بەدەم باوەو مزگەوتەکەش دەڕوخێنێ بحار الانوار ٣٨٦/٥٢

ئەوەی کەبلاو زانراوە بەڵکو شتێکی دروست و سەلمێنراوە لای زاناو فەقیهەکانی ئێمە ئەوەیە کە مزگەوتی (کەعبە) هیچ گرنگییەکی نییە ، وە (کەربەلا)زۆر لەو چاکترو باشترە (کەربەلا)بە پێی ئەو دەقانەی فوقەهاکانی ئێمە هێناویانەو باسی دەکەن بەڕێزترین پارچە زەوییە کە خواهەڵیبژاردووەو پیرۆزەو ، خواو پێغەمبەرەکەی ڕێزیان لێناوەو ، ڕوگەو قیبلەی ئیسلامەو خۆڵ و گڵەکەی شیفاو چارەسەری تێدایە ، وە هیچ زەوییەك هەتا (کەعبە)ش ناگاتە زەوی (کەربەلا).

وەختی خۆی هەمو جارێك (سید محمد الحسين آل كاشف الغطاء) ی مامۆستامان ئەم شیعرەی دەوتەوە

ومن حديث كربلاء والكعبة لكربلاء بان علو الرتبة

لەبارەی (کەربەلا) و (کەعبە)وە سوێند بێت بەخوا (کەربەلا) پلەی بەرزترە

وەیەکێکی تر دەڵێ :

هي الطفوف فطُف سبعا بمعناها فما لمكة ، معنى مثل معناها

أرض ولكنها السبع الشداد لها دانت وطأطأ أعلاها لأدناها

تاکە سوڕانەوەیەك کەبە سوڕانەوە دابنرێت بریتییە لە سوڕانەوەی (کەربەلا)و ئیتر بێ نیازین لەسەردانی (کەعبە) ، و سوڕانەوەبەدەوریدا چونکەلەچاو

(کەربەلا)دا هیچ واتاو نرخێکی نییە ، (کەربەلا) ئەوەندە زەوییەکی پیرۆزو بەفەرە باوی زۆرە بەسەر (کەعبە)دا بەجۆرێك ژێر زەوییەکەی لەسەر زەوییەکەی بەنرخترە و ،هەربۆیەتەختی زەوییەکەی ملکەچی دەردەبڕێ بۆژێرزەوییەکەی بۆمان هەیە بپرسین: بۆچی (مەهدی)مزگەوت دەڕوخێنێ تا سەر بناغەکەی ؟ وەلام:چونکە ئەو موسولمانانەی دەمێننەوە ،ژمارەیان ناگاتە (لەدەیا یەکی ئەوان)؛ وەك (الطوسی) ڕونی دەکاتەوە کە (ئەم کارە ڕونادات تا نۆلەسەردەی خەلکی لەناو نەچن و نەڕۆن) الغیبة ص١٤٦

ئەویش بەهۆی شمشێرەکەی (مهدی)یەوە ، کەبەگشتی وتایبەتیش موسولمانی پێ لەناو دەبات.

٣–حوکم وياسای ئالی داود دەسەپێنێت:

(الکلینی)باسێکی تەرخان کردووە لەبارەی ئەوەی ،کاتێ پێشەوایان سلاویان لەسەر سەرکەوتن و زال بون ،حوکم دەکەن بە حوکمی بنەمالەکەی (داود) ،بەدواشایەت و بەلگەدا ناگەڕێن پاشان ڕیوایەت دەکات کە (أبو عبدالله) دەلێ:ئەگەر(مەهدی) هات لەنەوەی بنەمالەی (محمد) ە ، بەیاسای (داودو سلێمان) حوکم دەکات و ، داوای هیچ بەلگەیەك ناکات الاصول الکافی ٣٩٧/١

(المجلسی) ڕیوایەت دەکات :( مەهدی) چاوەڕوان کراو هەلدەستێ بەکارێکی تازە وپەراوێکی تازەو داوەرییەکی تازە. بحار الانوارص٢٥٤/٥٢ غیبة النعمانی ص١٥٤.

(أبوعبدالله )دەلێ: وەك ئەوەی ئائێستا مەهدی ،لەپێش چاومدابێ ئاوها دەیبینم ، لەنێوان مەقام و ڕوکن دا خەلکی بەیعەتی پێدەدەن لەسەرکتێبێکی تازە. بحار الانوار ١٣٥/٢، الغیبة ص١٧٦ بەم بەشە

کۆتایی پێدێنین بەم ڕیوایەتە ترسناکە :(المجلسی) ڕیوایەت دەکات کە (أبو عبدالله) خوالێی ڕازیبێت دەڵێ: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە ، کاتێ کە(مەهدی چاوەڕوانکراو) بەدەردەکەوێت ، چی دەکات ئەوازۆریەیان حەزیان دەکرد کەنەیبینن ، چونکە خەڵکی دەکوژێت ..... هەتا وای لێدێت زۆرێك لەخەڵکی دەڵێن: ئەم کەسە لەبنەماڵەی (محمد) نییە ، چونکە ئەگەر لەبنەماڵەی ئەو بوایە ڕەحم و سۆزی دەکرد بەو خەڵکە بحار الانوار ٥٢/ ٣٥٣ ، الغیبة ص١٣٥

(سید الصدر) ئەم ڕیوایەتە ڕون دەکاتەوەو دەڵێت: ( زۆربەی ئەو خەڵکەی دەیکوژێ لەموسوڵمانانە ) پاشان نوسخەیەك لە کتێبەکەی بۆ ناردم کەناوی (تأریخ مابعد الظهور)کەلەم کتێبەدا ئەم ڕون کردنەوەی داوە ،لەسەر ئەو نوسخەیەش کە بۆمنی بەدیاری ناردووە بەخەتی خۆی ،پێشکەشی کردوم

پێویست دەکات لەسەر ئەم ڕیوایەتە چەند شتێك بڵێین

١- بۆچی (مەهدی) شمشێر لەسەر عەرەب دادەنێ ؟ئایا مەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)خۆی عەرەب نەبووە ؟

٢- ئایامەگەر پێشەوای باوەڕداران ونەوەکانی عەرەب نەبون ؟

٣-ئایائەو (مهدی)یەی بە شمشێرلەعەرەب دەدا، وەك ئەوان دەڵێن مەگەر لەنەوەی پێشەوای باوەڕداران نییە ؟

٤- ئایالەنێو عەرەب دا بە مەلاین خەڵك نییە کە باوەڕیان بەهاتنی ئەو هەیە ؟ لەبەرچی تەنها کوشتن وسەربڕینەکە تایبەت بە عەرەبە؟ چۆن دەوترێت هیچ یەکێك لەعەرەبی لەگەڵدا نابێت ؟

چۆن دەکرێت مزگەوتی (کەعبە) و (مەدینە) بڕوخێنێت ؟ لەکاتێکدا بەدەقی قورئان (کەعبە) قیبلەو ڕوگەی موسوڵمانانە ؟ یەکەم ماڵە بۆخواناسی کەلەسەر

زەوییدا پەیدابووە وەپێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و پێشەوای باوەڕداران و پێشەوایانی دوا ئەو نوێژیان تێدا کردووە بەتایبەت (امام صادق) ماوەیەکی زۆر لە (کەعبە)دا ماوەتەوە .؟

وەختی خۆی وامان دەزانی (مەهدی) (کەعبە) دەخاتەوە سەر ئەو حاڵەتەی کەلەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هەبووە و پێش فراوان کردنی

بەلام لەدوایدا بۆم دەرکەوت کەمەبەست لەوەی کەدەڵێ: دەیگێڕێتەوە سەربناغەکەی ،ڕوخاندن وتێکدانییەتی تەخت کردنیەتی لەگەڵ زەویدا چونکە ئیتر ڕوگە (قیبلە)ی نوێژکردن دەگوازرێتەوە بەرەوە شاری کوفە

( الفیض الکاشانی) ، دەگێڕێتەوە کە: ئەی خەڵکی (کوفە) خوای گەورە بە شتێك ئێوەی خۆشویستووە ،کە هیچ کەسێکی تاوا خۆش نەویستووە ، نوێژگەی ئێوە ماڵی ئادەم و نوح و ئیدریس و ئیبراهیم ە، وە ڕۆژگار کۆتایی نایەت تا (حجر الاسود) بەردەکەی تیادا دانەنرێت. الوافی ٢١٥/١

کەواتە: گواستنەوەی (بەردە رەشەکە) لەمەککەوە بۆ کوفە و ، کردنی (کوفە) بە نوێژگە و ڕوگەی ماڵی (آدم و نوح و ادريس وابراهيم )، بەلگەیەلەسەر ئەوەی کە کوفە دەکرێتە ڕوگەی نوێژ لەپاش ڕوخاندنی مزگەوتی کەعبە ، چونکە ئیتر ئەوکات گەڕانەوەی بۆ پێش فراوانکردنی هیچ واتایەك نادات بەدەستەوە و هیچ سودێکی نامێنێت بۆیە پێویستە بڕوخێندرێ و لەناو ببرێ وەك لەریوایەتەکاندا هاتووە ئەو کاتە ڕوگەو بەردە ڕەشەکە دەچێتە کوفە، وەك لەپێشەوە زانیمان کە کەعبە لەلای زاناکانی ئێمە هیچ گرنگییەکی نییە، هەربۆیە ،دەبێ بڕوخێندرێت

جارێکی تر دەپرسینەوە: ئایا ئەو کارە تازەیە چییە کە(مهدی) پێی هەڵدەسێت؟

ئەو کتێبە تازەیەو ئەو حوکمە تازەیە چییە ؟

ئەگەر ئەو کارە لەو کارە بێت کەنەوەکانی (محمد) پێی هەستاون ،کەواتە کارێکی نویٚ نییە

ئەگەر ئەو کتێبە لەو کتێبانە بێت کەلەلای پێشەوای باوەڕداران بووە وەك ریوایەتەکان بانگەشەی بۆدەکەن لە کتێبەکانماندا ، ئەوە دیارە پەڕاوو کتێبێکی تازە نییە

وەئەگەردادوەرییەکە یەکێك بێت لەدادوەرییەکانی (محمد) و بنەماڵەکەی و ئەوکتێبەش غەیری کتێب و داوەرییەکانی ، غەیری داوەرییەکانی( محمد) و بنەماڵەکەی بکریٚ، ئەوە بێگومان کارێکی تازەیەو کتێب و داوەرییەکی تازەشە

بۆچی نا چونکە (مهدی) حوکم و داوەری بە حوکم و یاساکانی (آل داود ) دەکات وەك ڕابورد لە پێشەوە .؟

حوکمەکە ،لە حوکم و یاساکانی (آل داود) ە و کتێبەکەش ،لە کتێبەکانی ئەوەو ، دادوەرییەکەش بە پێی شەریعە ت و ڕێبازی ئەوان ، دەکریٚ ، بۆیە کارەکە کارێکی تازەیە ، بۆیە لە گێرانەوەکەدا هاتووە کە دەڵیٚ وەك ئەوەی ئائێستا ،(مەهدی) لەپێش چاومدابیٚ ، ئاوەها دەیبینم ،لەنێوان ،(ڕوکن و مەقام) دا خەڵکی بەیعەتی پێدەدەن ، لەسەر کتێبێکی تازە ، وەك لە پێشەوە ڕابورد . ماوەتەوە ئەوەی کەبزانی (مهدی) چی دەکات؟ بە پێی ئەو ریوایەتە ترسناکەی کە هەیە ، (مەهدی) دەست دەکات بە کوشتنی خەڵکی بەجۆرێکی وا کە خەڵکی ئاوات دەخوازن کە نەیبینن ، چونکە ئەوەندە بەبیٚ بەزەییانەو دور لەهەمو ڕەوشتێکی بەرز خەڵکی دەکوژیٚ هەتا زۆرێك لە خەڵکی دەڵێن ئەم

کەسە لە بنەماڵەی (محمد) نییە چونکە ئەگەر لەو بنە ماڵەیە بوایە ڕەحم و سۆزی دەبو !!

مافی ئەوەمان هەیە بپرسین: کێن ئەوکەسانەی کە (مهدی ) لەناویان دەبات ؟ خوێنی کام کەسانەیە ئاوەها بەم شێوەدڕندانە خوێنیان دەڕێژێ ؟

ئــەوە خــوێنی موسـوڵمانەکانە وەك ڕیوایەتــەکان باســی دەکــەن و (ســەید سەدر)یش ڕونی دەکاتەوە

کەواتە: دەرکەوتنی (مەهدی) دەبێتە مایەی نەگبەتی بۆسەر موسوڵمانان ،نەك سۆزو میهرەبانی ،بۆیە مافی خۆیانە کەبڵێن ئەم کەسە لەبنەماڵەی محمد نییە ،بەڵێ چونکە بنەماڵەی (محمد) بەسۆزو میهرەبانن لەگەڵ موسوڵماناندا ،بەلاّم مەهدی سۆزو میهرەبانی نییە بۆیە لە بنەماڵەی (محمد)یش نییە

پاشان ئایا (مهدی) سەرزەوی پڕناکات لە دادپەروەری پاش ئەوەی ستەم باڵی بەسەردا کێشابو بەسەر زەویدا ؟

دەی کەواتە داد پەروەرییەکەی لە کوێدایە ئەگەر نۆ لەسەردەی ئەو خەڵکە بەتایبەت موسوڵمانەکەشی بکوژێت؟ ئەم کارە بەڕاستی هیچ کەسێك لە مێژود شتی وای نەکردووە ، تەنانەت ئەو (شیوعیی )یانەی کەسورن لەسەرجێ بەجێ کردنی ڕێبازەکەیان لەسەر حیسابی خەڵکی جیا بیربکەرەوە !!! وە لە پێشەوە باسمان کرد ئەو (مهدی)یە کەدێت هیچ ڕاستی و بونی نییە ،بەلاّم کە دێت بەحوکمی بنە ماڵەی (داود) حوکم دەکات ،عەرەب و موسوڵمانەکان لەناو دەبات بەبێ بەزەییانە ،دەیان کوژێت. مزگەوتی (کەعبە) تێك دەدات هەروەها مزگەوتەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)یش ،بەردەڕەشەکە دەبات و کارێکی تازەو ،پەڕاوو کتێبی تازەو داوەرییەکی تازە دێنێ . کەواتە دەبێت ئەم (مەهدی) ە کێ بێت ومەبەست لێی چی بیە ؟

ئەو ڕاستییەی کەلەدوای چەندین ساڵی دوورودرێژ لە خوێندنەوەو گەڕان بەناو سەرچاوە گەورەو باوەڕپێکراوەکاندا بۆم دەرکەوت ،ئەو (مهدی) یەی کەلای ئێمە پێشی دەڵێن (قائم) بریتییە لە دەوڵەتی (ئیسرائیل)یان( دەجال ) چونکە: (حسن العسکری ) وەك ڕابورد و سەلماندمان هیچ منداڵێکی نەبووە ،بۆیە (أبو عبدالله ) ڕەزای خوای لێبێت ڕیوایەت دەکات (بەلام لەم ڕیوایەتە بێ بەرییە ) دەڵێ: ئەوەی سەر پێچیمان بکات لە دەوڵەت و دەستەلاتی ئێمەدا بەشی نییە خوا خوێنی ئەوانەی بۆ ئێمە حەلاڵ کردووە کاتێ (قائم)ەکەی ئێمە دەرکەوت. البحار ٣٧٦/٥٢

حوکم ی (آل داود) بۆ؟ئایائەمە ئاماژەنییە بۆ بنەماکانی جولەکە بۆ ئەم بانگەشەیە ؟

دروست بونی دەوڵەتی (ئیسرائیل) دەبێ بە حوکمی (داود)بەڕێوەبچێ ،دەوڵەتی (ئیسرائیل) یش ئەگەر دروست بو خۆی گرت یەکێك لە پلانەکانی لەناوبردنی عەرەب وبەتایبەت موسوڵمانەکانیان و بەگشتی موسوڵمانانی دیکە یە،وەك لەبەرنامەو پرۆگرامەکانیاندا هەیە

خەونی دەوڵەتی جولەکە تێك دان و ڕوخاندنی ڕوگە (قیبلە)ی موسوڵمانانەو تەخت کردنێتی لەگەڵ زەویدا پاشان تێکدانی مزگەوتی (مەدینە) و گەڕانەوە بۆ ئەوشارەی کەوەختی خۆی لێی دەرکرابون ،وەکاتێکیش کەئەم دەوڵەتە دروست بو کارێکی تازە فەرزدەکات بەسەر خەڵکیدا لەجیاتی قورئان کتێبێکی تازە دادەنێ وەداوەرییەکی تازە دەکات و پرسیاری بەڵگەناکات چونکە پرسیارکردن وداواکردنی بەڵگە یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی موسوڵمانانە بۆیە پەرتەوازەیی و پشێوی وستەم باڵ دەکێشێت بەسەرخەڵکیدا ،بەهۆی ڕەگەزپەرستی جولەکەوە

واباشه ئەم ئاگادارییەش بدەین کاتێك زاناکانمان دوانزه پێشەوایان بۆ شیعه داناوه ئەمه کارێکی به مەبەست بووه چونکه ئەم ژمارەیه ڕێك وەك ژمارەی نەوەکانی (بنی ئیسرائیل )وایه، کە پێیان دەوترێت: (أسباط بنی اسرائیل) هەر بەوەندەشەوه نەوەستاون بەڵکو هاتون ناوی (دوانزه ئیمامی) یان لەخۆیان ناوه وەك گەشبینییەك بەو ژمارەیه ، ڕقیان لە(جبریل)ە کە خوا لە قورئاندا بە (روح الامین)باسی کردووه ، وەدەڵێن خیانەتی کردوه چونکه دەبو (جبریل) وەحی بۆ (عەلی) ڕەزای خوای لێبێت ،بهێنایە بەڵام نەیبرد بۆ ئەو و بردی بۆ محمد (صلی الله علیه وسلم) هەربۆیه خیانەتی لە ئەمانەت کردوه؟!

لەبەرئەوەی ڕقیان لە (جبریل)ە ،ئەمەش سیفەتی (بنی اسرائیل) یەکانه قورئانیش وەلامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ (٩٧) مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ (٩٨)﴾البقرة ،ئەی محمد بە جولەکەکان بڵێ: هەرکەسێك دوژمنی جبریل بێت و ڕقی لێی بێت ،(جبریل) قورئانی بۆتۆ هێناوه بەفەرمانی خوا بەڕاست دانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی و ڕێنموییی و مژدەی تێدایە بۆ باوەڕداران بڵێ هەرکەس دوژمنی خواو فریشتەکانی و ،پێغەمبەرانی و ، جبریل و میکایل بێت ئەوه بێگومان کافرەو خواش دوژمنی کافرانه.

ئەوەتا خوا ئەو کەسانەی بەبێ باوەڕداناوه ،کە دوژمنایەتی جبریل دەکەن هەواڵیشی داوه کە هەرکەسێکیش دوژمنایەتی ئەو بکات ئەوا دەبێتە دوژمنی خوا.

---

[1] خیانەت کردنی جبریل یەکێکه لەبیرو باوەڕەکانی (غەرابیه)و (کیسانیه)کانە ،کەدو دەستەی ،شیعەن

یەکێك لەگەورەترین دەستی بێگانە ،لەپشت شیعەوەو دیارترین بەڵگە کە لەهەمو نەتەوەی ئیسلام لایداوە ئەوەیە کە دەڵێن :نوێژی هەینی نابێ بکرێ تەنها لەپشت ئیمام و پێشەوایەکی مەعصومەوە نەبێ

لەم ماوانەی دوایدا فتوا درا کە دروستە نوێژی هەینی لە (حوسینییە ) کاندا بکرێ ،سوپاس بۆ خوا من هەوڵێکی گەورەمدا تائەم کارەبکرێ بەماندانی مەرجەعە گەورەکان ،کەفتوایەکی وەها دەربکەن وەداوای پاداشت تەنها لەخوا دەکەم.

بەلاّم دەپرسم چ کەسێك بو بووە هۆی ئەوەی بەدرێژایی نزیکەی (هەزارساڵ) ،ئەو هەمونەوەیە لەم ماوەیە دا بێ بەش بکرێ لەنوێژی هەینی؟ دەبێ دەستێکی واشارەزابوبێ کەبەزیرەکی خۆی توانیبێتی (شیعە)لەنوێژی هەینی بێ بەش بکات،لەگەڵ ئەوەی بەدەق قورئان ،باسی واجب بونی نوێژی ، هەینی دەکات ؟؟!!

وەبەردەوام ئەو دەستە ، پیس و چەپەڵانە کار بۆ بڵاو بونەوەی ژەهرەکانیان دەکەن سەرۆکایەتی حەوزە لەڕۆژگاری ئێمەدا چەندین ڕێنمویی دەکرد ،بۆ پێویست بونی زۆرکردنی خراپە و ،ستەم و بلاّوبونەوەی بەنێو خەڵکیدا ،چونکە زۆربونی خراپە وادەکات ئیمام (مهدی) واتە:قائم لەژێرابەکەی خۆی بێتە دەرەوە وەزۆرێك لە شیعەکان بەدەم ئەم ڕێنماییەوە هاتن وجێ بەجێیان کرد بەهەمو جۆرەکانی خراپەوە ،. (سید البروجردی) بۆخۆی لەگەڕەکی(الثورة)- کە ئێستا مەدینە سەدری پێ دەڵێن- شاری بەغداد سەرپەرشتی جێ بەجێ کردنی دەکرد ،بۆنمونە ، ئەگەرکەسێك لەیەکێك لەکۆڵان وشەقامەکانی گەڕەکی (الثورة) بڕۆشتایەو ئافرەتێکی شۆخ وشەنگ وجوانی بدیبایە و سەرنجی ڕابکێشایە ئەوا بەیەك زەردەخەنە یابە ئیشارەتێکی چاو یەکسەر

ئافرەتەکە وەڵامی دەدایەوە و دەچون بۆکاری خراپ ،سەرۆکایەتی حەوزە هەریەوەندەوە نەوەستا بەڵکو ویستی لەتەواوی (عیراق)دا ئەم خراپی و بەرەلاَییە بلاَوبکاتەوە ، هەربۆئەم مەبەستە ئەهاتن پاسی گەورەیان بەکرێ دەگرت بەمەبەستی سەیران وگەشت وگوزاری باکوری عێراق و هانی ئەو خێزانانەیان دەدا کە لەباشور بون بچن گەشت بکەن بۆباکور چەندین خێزانت، دەبینی کە پێك هاتبون لەدایك وباوکێکی پیرو بەرگ وپۆشاکی ناشرین وکۆن لەبەریاندا تەنانەت یەکێکیان پارەی نان خواردنێکی تەواوی پێ نەبو چ جای خەرجی گەشت وگوزارو گەڕان ،جا هەریەك لەو خێزانانە چەند کچێکی جوانیان لەگەڵدا بو هەرکات پاسەکان بگەیشتنایە بەشارێك لەو شارانە کە پیایدا تێدە پەڕین کە بریتی بون لە (تکریت ، موصل ،دهۆك،هەولێر،کەرکوك)گەشتیارەکان چەند رۆژێك لەو شارە بارگەیان دەخست ،ئینجا کچەکان دەچونە نێو بازارەکانی ئەو شارەو خۆیان پیشانی گەنجەکان دەدا تا رێکەوتنێکی حەرام دروست دەبو ، ئەمە ناوشارەکان ،خۆئەگەر باسی مانەوەی ئەو خێزانانەی کە لە سەیرانگاکان دەمانەوە ئەوە بەراستی نازانم چۆن ئەو شتانەتان بۆ باس بکەم کەلەوێ ڕویدەدا

مەبەست لە بلاَو کردنەوەی ئەم جۆرە هاندان و رێنمونیی کردنە تەنها بلاَوبونەوەی خراپەکاری و وێرانکردنی ولاَت بو ،دەنا هاتنە دەرەوەی ئیمامی دوانزەهەم ، کەناسراوە بە (قائم) من زۆر دلنیام کە ئەوانیش دەزانن ئیمامی وا هەربونی نییە

جا سەیری ئەم دەستە گلاَوانە بکە بزانە چی دەکات و چی کردووە ؟!

## کۆتایی

پاش ئەم گەڕانە ماندوکێشە لە ڕونکردنەوەی ئەم ڕاستی یە ئازار کێشانە دەبێ ئێستا چی پێویست بکات لەسەرم کە بیکەم ؟

ئایا لەجێگەو پلەو پایەکەی خۆمدا دابنیشم و خەریکی ئەو سامان و دارایيە بێ شومارەبم لەخەڵکی سادەو داماو کۆی بکەمەوە کە بەناوی پێنج یەك وبەخشین و دیاری بۆ شوێنە پیرۆزەکان دەیهێنن و سواری ئوتومبێلی کەشخەو جوان بم و لەگەڵ کچەجوان وشۆخەکاندا ڕابوێرم ؟

یا واز لەم دنیا بەسەرچووە بهێنم ولەم حەرامانە دور بکەومەوە و بانگەشەی ڕاستی بەجێ بهێنم و حەق بڵێم؟ ( چونکە ئەوەی لەڕاستی بێ دەنگ بێت شەیتانێکی لاڵە ).

بەڕاستی زانیم کە (عبدالله بن سبأ)ی جولەکە بناغەی شیعەگەری داناوە و موسوڵمانانی پەرتەوازە کردو ڕق وکینەی خستە نێوانیان پاش ئەوەی کە خۆشەویستی وباوەڕ هەمویانی کۆکردبۆوەو دڵەکانی پێکەوە گرێدابو. هەروەها بۆم دەرکەوت کە ئەوەی باوباپیرانمان (خەڵکی کوفە) کردیان بەئالی بەیت و ،ئەوەی کتێبەکانمان دەیگێڕنەوە لەبارەی وەلانانی پێشەوایان و تانەدان لێیان و بێزاری ئالی بەیت لەدەست لایەنگرانیان وەك لەپێشەوە باسمانکرد.

ئەم وتەیەی پێشەوای باوەڕداران خوالێی ڕازیبێت ڕاستێتی ئەوان دەردەخات کەدەڵێ: ئەگەر لایەنگرانم جیابکەمەوە ئەوا هەمویان شوێن کەوتەی (واصل)ن وەئەگەر تاقیشیان بکەمەوە هەمویان بەهەڵگەڕاوە لەدین دەبینمەوە وە ئەگەر پاڵفتەشیان بکەم لەهەزارا یەکێکیانم بۆجیاناکرێتەوە. الکافی ٨/٢٣٨.

بۆم دەركەوت درۆدەكەن بەدەم خواوەو ،خوابەدرۆ دەخەنەوە چونكە خوای گەورەباسی لەوە كردووە هیچ دەستێك ناتوانیٚ ئەم قورئانە تێك بدات و تواناشی نییە چونكە خوا خۆی پاراستنی لەئەستۆ گرتووە بەڵام فەقیهەكانمان دەڵێن : قورئان تێك دراوە ،بەمەش قسەی خوا ڕەت دەكەنەوە جا باوەڕ بەكامیان بكەم ؟ بەوان؟یابەخوای گەورە؟

بۆم دەركەوت كە (موتعە)حەرامە بەڵام فەقیهەكانمان حەڵاڵیان كردووە و كار گەیشتۆتە ئەوەی نێربازی لەگەڵ گەنجە لوس وبیٚ مووەكانیشدا حەڵاڵ بكەن !!

بۆم دەركەوت كە شیعە واجب نییە پێنج یەك بدات و ببەخشێت بە فەقیە وموجتەهیدەكان ،بەڵكو مافی خۆیەتی و بۆی ڕەوایە چی لیٚ بكات تا (مەهدی) پەیدا دەبێت ،بەڵام ئەوە فەقیهەكانمانە كە واجبیان كردووە لەسەر خەڵكی كەدەبێت پێنج یەك بدەن ،ئەمەش تەنهابۆ مەبەستی تاكەكەسی خۆیانە. وەبۆم دەركەوت دەستی نهێنی وشاراوە شیعەگەری دروستكردووە ئەوكارانەی پێكردووە كەلەوەو پێش ڕونمان كردەوە ئیتر لەپاش ئەمانە چی وام لێبكات كەلەناو شیعەدا بمێنمەوە ؟

(محمد بن سلیمان) لەباوكیەوە دەڵێت: بە(أبو عبدالله)م وت: بەفیدات بم ئێمە بەجارێك لامانداوە، پشتمانی قورس كردووەو دڵەكانمانی مراندووە و، دەستەلأت داران خوێنیان حەلأڵ كردوین ،بەهۆی چەند حەدیسێك كە فەقیهەكانمان ،بۆیان دەگێڕنەوە

(أبو عبد الله )ڕەزای خوای لێبێت دەڵیٚ : مەبەستت ڕافیزەكانە ؟دەڵیٚ: بەڵیٚ ئەویش دەڵیٚ سوێند بەخوا ئەوان ئەو ناوەیان لە ئێوە نەناوە بەڵكو خوا ئەو ناوەی لێناون روضة الكافی ٣٤/٥

جائەگەر (أبو عبدالله) شایەتیان لەسەر بدات کەئەوان ڕافیزەن ،چونکە ئال وبەیتیان نەویست، وە خوا ئەوناوەی لێنابن ، ئیتر چی وام لێبکات لەگەڵیاندا بمێنمەوە ؟

(أبو عبدالله)دەڵێ: ئەگەر(مەهدی) بێت سەرەتا لەولایەنگرانەی ئێمەوە دەست پێ دەکات ودەیان کوژێت کە درۆزن بون رجال الکشی ص٢٥٣ ،ترجمة ابن الخطاب.

بۆچی لە درۆزنەکانی شیعەوە دەست پێ دەکات ودەیان کوژێت ؟

پێش خەڵکی تر دەیان کوژێت؟ لەبەر ناشرینی و قێزەونی ، ئەو هەمو درۆیانەی کە هەڵیان بەستووەو کردویانە بەدین وخۆیانی پێ لەخوانزیك دەکەنەوە وەك حەلاڵی (موتعە)و(نێربازی) و واجب بوونی دەرکردنی پێنجیەك لەسەروەت وسامان و ناڕاستی قورئان، سەرەتا بڕیاردان بۆ دروست بونی خوا و گەڕانەوەی ئیمامەکان هەرهەمو زاناو موجتەهیدەکان باوەڕیان بەم جۆرە بیرو باوەڕانەو هەیە، دەبێ کامیان لە شمشێری (مەهدی) ڕزگاری بێت ؟؟!!

(أبو عبدالله) دەڵێ: خوا هەر ئایەتێکی لەبارەی دووڕووەکان ناردبێتە خوارەوە ئیللا ئەو ئایەتە بۆ ئەو کەسانەشە کە خۆیان بە شیعە دادەنێن رجال الکشی ص٢٥٤

(أبو عبدالله) ڕاستی وتووە بەدایك وباوکەوە بەفیدای بم ،کەواتە: ئەگەر ئەو ئایەتانەی بۆ دووڕووەکان دابەزیبێ بەسەر ئەوانەی خۆیان بە شیعە دەزانن تەطبیق ببێت ئیتر چۆن لەگەڵیاندا بمێنمەوە ؟

ئایا دەگونجێت لەپاش ئەمە ئەوانە بانگەشەی ئەوە بکەن کەلەسەر ڕێڕەوی ئال وبەیتن؟؟ ئایا ڕاستە ئەوەی ئەوان دەیڵێن گوایە ئەهلی بەیتیان خۆش

دەوێ ؟ئێستا من وەڵامی هەمو ئەو پرسیارانەم زانی کەوەختی خۆی سەرسام وسەرقاڵیان بوم و بیرم پێوەیان خەریك بو .

لەپاش ئاشنا بونم بەم ڕاستیانەو گەلێ ڕاستی تر گەڕام بەشوێن هۆکاری ئەوەی بۆچی من بەشیعەیی لەدایك بوم و هۆکاری بون بە شیعەیی بنەماڵەکەم وخزمەکانم چی بو ؟لەپاشان زانیم کەوەختی خۆی هۆزەکەم لەسەر ڕێبازی سوننە بون بەڵام پێش نزیکەی ١٥٠ ساڵێك ،هەندێك لەبانگەوازخوازانی شیعەی ئێرانی هاتون بۆ باشوری عێراق پەیوەندیان بەهەندێك لەسەرۆك خێڵەکانەوە کردووە ، دڵپاکی وکەم زانستی ئەوانیان قۆستۆتەوەو بەقسەی جوان و ڕازاوە هەڵیان خەڵەتاندون و ئیتر ئەمە بۆتە هۆی چونە ناوەوەی ئەمانە بۆناو شیعە زۆرێك لە هۆزو خێڵەکان کە وەختی خۆی سوننی بون بەم ڕێگەیە بونەتە شیعە .بە پێویستی دەزانم وەك ئەمانەتێکی زانستی باسی هەندێ لەو خێڵ و هۆزانە بکەم :لەوانە: بنو ربیعه ،بنو تمیم ،الخزاعل ،الزبیدات ،العمیر ،کەیەکێکە لە خێڵەکانی هۆزی (بنی تمیم)، الخزرج، شمر طوکة الدوار ،الدفافعە ،آل محمد. ئەمانە لە خێڵەکانی پارێزگای (عەمارە)ن ؛خێڵ و هۆزەکانی پارێزگای (دیوانیە)ش بریتین لە: آل أقرع ،آل بدیر،عفج،جبور ،جلیحة ،کعب ،بنولام، زۆرێکی تریش

ئەم خێڵ و هۆزانە هەمویان لەو هۆزە عێراقیانەن ،کەلە ئەصڵدا لە عێراق بون و ناسراون، وەناسراون بە ئازایەتی و مەردایەتی و ڕێز، ئەمانە لە هۆزە گەورەکانی ناوچەکەن کە کێش و قورسایی خۆیانیان هەیە چونکە لە هۆزە عەرەبە ڕەسەنەکانن بەڵام بەداخەوە ؛ نزیکەی زیاد لە (١٥٠)ساڵێکە ،بونەتە شیعە بەهۆی ئەو تەوژمە بانگەشە شیعە خوازانەی کەلە ئێرانەوە ،هاتن و هەڵیان فریواندن و بەچەندین ڕێگە کردیانن بە شیعە

ئەم هۆزو خێڵە ئازایانە لەگەڵ ئەوەی کە شیعەشن بەڵام بیریان چووە کە شمشێرەکەی (مهدی) ناسراو بە (قائم)چاوەڕێی پەڕاندنی سەریان دەکات وەك لە پێشەوە باسمانکرد چونکە ئیمامی دوانزەهەم کەناسراوە بە (قائم) بە خراپترین شێوە عەرەب دەکوژێت ، ئەگەرچی شیعەش بن ، ئەمە کتێبەکانمان بەڕاشکاوانە باسی دەکەن دەبا ئەو هۆز و خێڵانە چاوەڕێی شمشێرەکەی (قائم) بکەن تالەناویان دەبات!!!

بەڕاستی خوای گەورەپەیمانی لە ئەهلی عیلم وەرگرتووە ،کەدەبێ ڕاستی بۆخەڵکی ڕون بکەنەوە ،وە ئەوەتا من ئەم کارەش ئەنجام دەدەم وە خەوتوەکان لەخەو هەڵدەستێنم و بێ ئاگاکان بە هۆش دێنمەوە ، وە بانگەشەی هەمو ئەو هۆزە ڕەسەنە عەرەبیانە دەکەم کە بگەڕێنەوە سەر ئەصڵ و ڕەسەنایەتییەکەیان لەژێر کاریگەری ئەو عەمامە بەسەرانەدا نەمێننەوە تا بەناوی پێنج یەك وبەخشینەوە ،ماڵ وسامانیان ببەن و لەژێر ناوی (موتعە)دا دەست درێژی بکەنە سەر ئافرەتەکانیان چونکە پێنج یەك و (موتعە) حەرامن ، وەك لە پێشەوە باسمان کردن وە بگەڕێنەوەو چاوبگێڕنەوە بەمێژوی خۆیان و پێشینەکانیاندا تا ئاگاداری ئەو ڕاستیانە بن کە فەقیە و عەمامە بەسەرەکان لێیان هەڵەکردون و سڕیویانەتەوە لە پێش چاویاندا لەبەرخاتری بەرژەوەندی تاکە کەسی خۆیان

بەم جۆرە من ئەتوانم بەشێك لەو ئەرکەی لەسەر شانمە بەجێ ی بهێنم

فەتوای کوشتنی نوسەر

بەدەرچونی ئەم کتێبە لەلایەن مەرجەعەکانی شیعەوە ،فەتوای کوشتنی نوسەرەکەی درا کەئەمەش دەقی تەرجەمەکراوەکەیەتی لەگەڵ دەقە عەرەبیەکەیدا

بۆ بەرێز ئایە تولڵای گەورە سەرۆکی حەوزەی عیلمی ،مەرجەعی دینی گەورە (سیدحسین بحر العلوم ) خوا سێبەری فراوانیان بەردەوام بکات فتوامان بۆ بدەن خوا پاداشتتان بداتەوە ، بۆچونی بەرێزتان لەبارەی (سید حسین الموسوی )وکتێبەکەی بەناوی (لله ثم للتأريخ)

**نصير عبد الزهرة**

ئەویش لەوەڵامدا بۆی دەنوسێ :بەناوی خوا بۆچونی ئێمە دەربارەی (حسین الموسوی ) دەڵێین : ئەو کەسە گومڕاو گومڕاکارەو خواوەك دڵی کوێر کردووە بەرچاوڕۆشنیشی لێ سەندۆتەوەو کوێری کردووە وە بۆتە مایەی ئاژاوە بۆ زۆرێك لە خەڵکی نەفرینی خوای لێبێت

سەرۆکایەتی حەوزە هەستا بە دابەزاندن و لێسەندنەوەی هەمو ئەو پلە زانستیانەی کە هەیبو وە هەمو بڕیارەکانی هەڵگەڕاوەی بەسەردا دەچەسپێت و پلەو هۆکارە زانستییەکانی نابنە پاراستنی گەردنی

وە فتواشمان دا بەوەی کە حەرامەو نابێت ئەو کتێبە بخوێندرێتەوە کە بەناوی (لله ثم للتأريخ) ە.

**الحسين آل بحر العلوم**

**٢٠صفر١٤٢١هـ**

دەقە عەرەبییەکەی

سماحة آية الله العظمى زعيم الحوزة العلمية المرجع الديني الأعلى السيد حسين بحر العلوم ، دام ظله الوارف أفتونا جزاكم الله خيراً ماهو قولكم بالسيد حسين الموسوي و ماهو رايكم في كتابه المسمى (لله ثم للتأريخ).                    نصير عبد الزهرة.

وەڵام

بسمه تعالى

قولنا في المدعو ، حسين الموسوي ،أنه ضال مضل ،أعمى الله بصيرته كما اعمى قلبه ،وقد اصبح سبباً في فتنة كثير من الناس ،لعنه الله ،وقد قامت ، زعامة الحوزة ،بإسقاط جميع درجاته العلمية وإعتبار جميع احكام المرتدين ،منطبقة عليه ، وأن وسائله العلمية غير مبرئة للذمة ، وأصدرنا فتوى ، بتحريم ،قراة كتابه المسمى (لله ثم للتأريخ)

أ.هـ

الحسين آل بحر العلوم                    ٢٠صفر ١٤٢١

